بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری

فەرهاد پیربالْ

# حەشیشەکێشەکان

چیرۆکێکی سیناریۆ
و
چەند شانۆنامەیەکی یەک پەردەیی

بڵاوکراوەکانی وەزارەتی رۆشنبیری

پیتچنین و نەخشەسازی و بەرگ: ماڵی شەرەفخانی بەتلیسی
چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری
هەولێر: ٨/ ٢٠٠٠
ژمارەی سپاردن:

**برادەر گیان ئاگاداربە، نەوەک لەپڕ بتکوژم!**

شانۆنامەیەکی یەک پەردەییە



**کسایەتییەکان:**

**سەربازی یەکەم:** گەنجێکی گەنمڕەنگ، تەمەنی لە دەوروبەری ٢٩ ساڵدایە، جلوبەرگی سەربازیی لەبەرە.

**سەربازی دووەم:** تەمەنی ٣٢ ساڵێکە، لە سەربازی یەکەم نەختێ بەخۆوەترە، شێوەی بێریە و جلوبەرگە سەربازییەکەی لەگەڵ هی یەکەم جیاوازە.

هەردووکیان سەروقژ بژ و تۆزاوین، قاچ وقول و جلوبەرگیشیان قوڕاوین. شڕۆڵ و شەکەت دیارن.

**شوێن:**

ئەرەیەکی تاریک و سامناکی نێو جەنگەڵێکی سەر سنوور. درەختەلانەکە هێندە تێکچڕژاو و چڕ نیە، بەلام درەختەکانی: بێ سێبەر، بێ سەوزین. گەلا و لقەدار و گژوگیا بە شەونم تەڕەکانیش، لەگەڵ چەند گۆماوێکی لیخن، لێرە و لەوێ، لەژێر پرتەوی مانگەشەودا دەترووسکێنەوە. لە جریوە و جووکەی نامۆ زیاتر، دەنگی هیچی تر لەو ناوە نایەت.

**سەربازی یەکەم:** ( بە پەژموردەییەوە پشتی داوەتە بنەداریک و هەر دوو قاچی درێژکردووە. بێریە و قایشەکەی لەم لا و لەو لا فڕێ دراون. دوگمەکانی کراسە سەربازییەکەی تا خوار سنگی کراونەتەوە و فانیلە سپییەکەی بەدەرەوەیە. ئانشکی راستی بەسەر قووچەکێک خۆڵدا گرتووە. لەوە دەچێ تازە لە خەو هەڵسابێتەوە. چاوی بڕیوەتە برادەرەکەی، لێی ورد دەبێتەوە) تۆ نیازت وایە لە ئێستاوە بەڕێ بکەوی ؟

**سەربازی دووەم:** ( لای چەپی شانۆ، لە بەشی پێشەوە دانیشتووە، خەریکی کردنەوەی قەیتانی پۆستاڵەکەیەتی) من؟ نەخێر. دەمەوێ نەختێ شلی بکەمەوە. ئەم نەعلەتییە، پێم لەناویدا رزایەوە. ئەوا بۆ هەفتەیەک دەچێ دامنەکەندووە. (وێستانێکی کەم. بە ئازارەوە) لە ڕێگەدا وەک دووپشک دەچزا بە پەنجەکانمەوە.

(نەختێ بێدەنگی)

**سەربازی یەکەم:** ( بە ترس و نامۆییەوە چاو بە ئاسماندا دەگێڕێ) لەوە دەچێ شەو زۆر درەنگ بێ ! ( دەنگی تەقە لە دوورەوە) گوێت لەو تەقە دوورانەیە ؟

**سەربازی دووەم:** ( دووای بێدەنگبوونێکی کەم) چیە، تێناگەم: من شلەژان و ترسێکی یەکجار زۆر لە تۆدا بەدی دەکەم ؟

**سەربازی یەکەم:** راستییەکەی، برادەر، دەمەوێ دان بە راستییەکدا بنێم: من دەترسم.

**سەربازی دووەم:** لە چی ؟

**سەربازی یەکەم:** بە تەواوەتی نازانم. ترسێکە ! ئەم شوێنەی کە ئێمە لێین زۆر سامناکە !

(نەختێ بێدەنگی)



**سەربازی دووەم:** من وا زەن دەکەم کە تۆ تا ئێستا لە من دڵنیا نەبوویبێت!

**سەربازی یەکەم:** ئەمە قسە نیە تۆ دەیکەی، برادەر. من بەڕوونی دووام، وتم: " لە شوێنەکەمان دەترسم". تۆ ـ خۆشت دەزانی کە جەنگەڵێکی سەر سنووری نێوان ئەم دوو دۆزەخە هەرگیز جێگای متمانە و دڵنیایی نیە. زۆر دوور مەبینە کە تۆپەکانیان، تەنانەت خۆشیان، بگەنە ئێرە و بەسەر ئێرەشدا دادەن. بەراستمە !

**سەربازی دووەم:** نەخێر، وانیە. تۆ دڵنیابە! ئێرە مەڵبەندێکی زۆر لاتەریک و گیرە ( وەستانێکی کەم) تۆ بە کام ڕێگەوە بەرەو ئێرە راتکرد ؟

**سەربازی یەکەم:** من خۆشم نازانم. بەتەواوەتی بیرم نەماوە. من وەختێ بەرەو ئێرە رامکرد، خۆ بۆ خۆشم نەمدەزانی بە چ ڕێگایەکدا و بەرەو کوێ رادەکەم. دووای ماوەیەک کە سەیرم کرد: خۆم لەنێو ئەم جەنگەڵەدا بینییەوە.

**سەربازی دووەم:** تۆ لەوانەیە بە دۆڵەکەی ئەم بەرەوە گەیشتبێتیە ئێرە.

**سەربازی یەکەم:** ئەی تۆ ؟ تۆ چۆن گەیشتیتە ئێرە ؟

**سەربازی دووەم:** من زۆر بەئاگاییەوە هەڵدەهاتم: هەر لە سەرەتاوە دەمزانی بەرەو کوێ رادەکەم؛ دەشمزانی کە دەگەم بەم جەنگەڵە ( وەستانێکی کەم) تۆ دڵنیابە ! ئێرە شوێنێکی وا نیە کە بتوانن بەئاسانی ئەو چڕستانەی ئەم دیومان ببڕن و ئێرە بدۆزنەوە. نەء .

(نەختێ بێدەنگی)

**سەربازی یەکەم:** برادەر، تۆ بە قسەکانتەوە دیارە، لەوە دەچێ کە ئەم مەڵبەندە هەمووی باش شارەزا بیت؟

**سەربازی دووەم:** من پێش ئێستا زۆر کەرەتی دیکە هاتووم بۆ ئەم ناوە. هەروەها وەختی منداڵیشم، لەگەڵ باوکم، کە قاچاغچی بوو، بە بیرم دێ، ئەم ناوە بست بە بستی گەڕاوم (پەنجە بۆ درەختەکانی ئەوبەر، بۆ شاخەکان درێژ دەکات) پشت ئەم شاخانە پێی دەڵێن (گریان)، ئەمبەریشی گۆڕستانێکە. خەمت نەبێ ، ئەم شوێنەی ئێمە ئەرەیەکی گەلێ ئەستەم و لاچەپە. تەنانەت سەگیشیان پەی پێرە نابات. ( لە شلکردنەوەی قەیتانی پۆستاڵەکەی دەبێتەوە. هەر بە دانیشتنەوە نەختێک بەرەو دووا دەکشێتەوە و بە ئازارەوە پشت بە درەختەکەی پشتییەوە دەدات) ئاه ! من گەلێک ماندووم، برادەر! تۆش وەک من ماندووی؟

**سەربازی یەکەم:** خەریکە جومگەکانم لێک دەردەچن.

**سەربازی دووەم:** سەعاتێک بوو هەر رامدەکرد. لەوە دەترسام بە دووامەوە بن ! ( سەیری دەست و پل و ناولەپەکانی خۆی دەکات) لە رێگە بەسەر تلیشەبەرد و درکەزییەکی زۆردا کەوتم ( نەختێ بێدەنگی. دەیەوێ راکشێ. سەیری برادەرەکەی دەکا، وەک ئەوەی بیەوێ دڵنیای بکات) برادەر گیان، لەم شوێنە چاکترمان دەست ناکەوێ کە نەختێ پشووی تێدا بدەین. خۆ چەند زووتریش بەرێ بکەوین، باشترە. بەڵام من، راستییەکەی، هیلاکم. دڵنیاشم کە برسێتی لە رێگە دەمانخا. من کاتی خۆیشی بەرگەی برسێتیم هێندە نەدەگرت. هیچت پێ نیە بیخۆین؟

**سەربازی یەکەم:** نەخێر، بەداخەوە ( نەختێ بێدەنگی) من کاتێ رامکرد، خۆ هیچ تینوێتی و برسێتییەکم لە یاد نەمابوو؛ تەنانەت فریای هێنانی چەکەکەشم نەکەوتم.

**سەربازی دووەم:** ئاه، من ئێستا دەڵێی یەکەم جارە لە



ژیانمدا هەست بە برسێتی دەکەم.

**سەربازی یەکەم:** برسیتە ؟

**سەربازی دووەم:** زۆر زۆر.

**سەربازی یەکەم:** من هێندە نەء .

**سەربازی دووەم:** تۆ باش بوو بۆ خۆت سەرخەوێکی خۆشت کرد؛ نەختێ حەسایتەوە. دەمێک بوو لێرە راکشابوویت ؟

**سەربازی یەکەم:** نازانم ( بە سەرسوڕماوییەوە) چما من خەوم لێ کەوتبوو ؟

**سەربازی دووەم:** من غەدرم لێ کردیت.

**سەربازی یەکەم:** بۆچی ؟

**سەربازی دووەم:** لەو خەوە خۆشەت بەخەبەرم کردیتەوە.

**سەربازی یەکەم:** نەخێر، بەپێچەوانەوە؛ وا مەڵێ ! باش بوو لە خەوت هەڵساندم. من دڵنیام ئەگەر تۆ بەسەرما نەهاتیتایە، لەوانە بوو تا چوار رۆژی دیکەش باگا نەهاتمایەتەوە. زۆر شەکەت بووم.

**سەربازی دووەم:** ئێستەش هەر پێتەوە دیارە، بۆرژاوی. کەمێک ئیسراحەت بکە ! جاری شەو زۆری بەبەرەو ماوە (بەپرتاو) دەزانی من لە سەرەتادا ویستم بتکوژم ؟ (وێستانێکی کەم) سەیرم پێ دەهات ! ئاخر، من کە هاتم و چاوم پێت کەوت، تۆ لەژێر درەختەکەدا زۆر سەیر گرمۆڵە ببوویت. لە مرۆڤ نەدەچووی. نەختێک لێت نزیکتر کەوتمەوە و هەستی خۆم راگرت، گوێم بەئاستەم تەنها لە نووزەیەکت بوو. نزیکەی سێ چوار دەقیقە، لەدوورەوە، هەر لێت وردبوومەوە. بیرم دەکردەوە، دەمگوت: " خوایە ! هیچ گورگێک، هیچ گیاندارێک لەم ناوە نەماوە کە دەستی ئاگر و گوللە نەیگەشتبێتێ؛ لە سەربازێکی بەدبەختی وەک من

زیاتر، مرۆڤ بەم نیوەشەوە کاری بەم جەنگەڵە سامناکەوە چیە کە بێت وا بەئارامیەوە لێرە پاڵ کەوێت ؟''. بەڵام باش بوو هێندەی پێ نەچوو، جووڵایەوە. کە جووڵایەوە و سەرتم بەدی کرد ئینجا زانیم کە مرۆڤیت.

**سەربازی یەکەم:** بەراستیتە ؟

**سەربازی دووەم:** باوەڕ بکە، من لەسەر ئەوە بووم کە میلی چەکەکەشم بهێنمەوە. سوپاس بۆ خوا؛ من ئێستا هەست بە بەختەوەرییەکی زۆر دەکەم لەوەی کە نەبوویتە قوربانیی ئەم ساتە نەفرەتلێکراوەی سەرلێشێواویی من.

**سەربازی یەکەم:** سوپاس، برادەر. منیش چاکەی تۆم قەت لەبیر ناچێ. هەمیشە وەک ئایەتێکی هەڵکەندراوی سەر دڵم دەیپارێزم (وێستانێکی کەم، بەغەمگینی و سۆزەوە) تۆ زۆر بەشێنەیی و خەمخوارییەوە لە خەوت هەڵساندم (بە ڕەتاوی و هێمنییەوە) دەزانی، برادەر، من وا بۆ سەری نۆ مانگان دەچێ، ئەمە یەکەم جارە کە دەستی مرۆڤ وا بەنەرمی و شێنەییەوە لە خەوم هەڵبستێنێ !

**سەربازی دووەم:** بەڵێ، برادەر، حاڵی ئێمەش لە هی ئێوە چاکتر نەبوو. هەموو بەیانییەک وەکو یەکتر: لەجیاتی چرپە و دەستی نەرمی ژن، سەرە سمکی پۆستاڵان یانیش زرمەی تۆپ و دەسرێژەکان وەخەبەریان دەکردینەوە. بەڵێ، ئەوەیە برادەر. ئەوەی بە ژیانی نێو ئەم جەنگە هەڵبکا، بێگومان دەتوانێ بە ئاسانی بە هی دۆزەخیش هەڵبکا.

**سەربازی یەکەم:** ئاخ برادەر، وەختی خۆی گلەییم لە بەختی خۆم دەکرد و لە ژیانی خۆم ناڕازی بووم، دەمگوت: '' ڕەنج زۆر دەدەم و هێشتاش هەر نەبوونم''. کاتێ سەفەری پایتەختم دەکرد بۆ کارکردن، ئەگەر تەنیا سێ هەفتە کەسوکاری خۆم



نەدیبایە، دەمگوت: '' من چۆن دەبێ سێ هەفتە چاوم بەماڵەوە و ئاشنایانی خۆم نەکەوێ ؟''. کەچی ئێستاش ! هەیهات ! هەیهات برادەر ! خۆزگەم هەر بەو ژیانی کرێکاریی جارانم !

**سەربازی دووەم:** تۆ چەند دەبێ سەرت لە شارەکەی خۆت نەداوەتەوە ؟

**سەربازی یەکەم:** ( بە حەسرەتەوە) زۆر لەمێژە، برادەر، زۆر لەمێژە ( بەبێزارییەکی پڕ لە رقەوە) من ئەگەر باسی ژیانی خۆمت بۆ بکەم، هەرچی دەریای دنیا هەیە پڕی دەکەی لە تفی نەفرەت و دەیدەیتە رووی ئەو گەواد و کافرانەوە. خوانەناسن، بێ ویژدانن. نۆ مانگ، نۆ مانگی ڕەبەق، وەک ئامێردێک، لە سەگی پێ سووتاو بێزەوەرتر، هەر ئەم بیابان و ئەو بیابان و ئەم دەشت و ئەو دەشتیان پێ دەکردین. تا لە دووایین جاردا هێنایانین بۆ ئەم مەڵبەندی سەر سنووری باکوورە. لەوە دەچوو کە تەنانەت ئیجازەشمان پێ بە ڕەوا نەبینن. هەموویشی لە ترسی ئەوەیان بوو کە نەوەک لەدووای ئیجازەکەمان نەگەڕێینەوە و رابکەین ( وەک ئەوەی یادگارێکی تاڵی بیرکەوتبێتەوە) برادەر، لەم دوو مانگەی دوواییدا سەد و سی سەرباز زیاتریان ـ لەوانەی کە فیراریان کردبوو، گوللەباران کرد: ئەو سەربازانە لەنێو قامیشەڵان و زەلکاوەکاندا خۆیان حەشار دابوو. ئەرێ ئێوە هەواڵی کوژرانی پێنج ئامرهێزەکانی ئێمەتان نەبیستەوە کە لەم شەڕەی دوواییدا کوژرابوون؟

**سەربازی دووەم:** نەخێر، نەء.

**سەربازی یەکەم:** لە سەنگەرەکانی خۆیانەوە، لەدوواوەڕا تەقەیان لێ کردبوون.

**سەربازی دووەم:** لە شەڕەکەی باشوور دەڵێی ؟
**سەربازی یەکەم:** بەڵێ، ئا.
**سەربازی دووەم:** تۆ ـ خۆت لەو شەڕە دابووی ؟
**سەربازی یەکەم:** هەهـ ( بەتەوسەوە) گەر لەوێ بوومایە ئێستە لەوانە بوو بەس تەنیا گوێچکەیەکم لێرە کەوتایە.
**سەربازی دووەم:** شەڕێکی پیس بوو.
**سەربازی یەکەم:** دەیانگوت: " سەربازی کوژراو لە بەردی دەو زێیان زێتر کەوتبوون". تیپێکی تەواوی سەربازەکانی ئێمە، بە چەک و تفاق و ئەفسەرەوە، خۆیان تەسلیمی هێزەکانی ئێوە کردبوو.
**سەربازی دووەم:** بەڵێ، ئەوەم بیست.
(تاوێک بێدەنگی)
**سەربازی یەکەم:** من لەو باوەڕەدام ئەگەر دوو هێرشی دیکەی ئاوهاتان بکردایەتە سەرمان، ئیدی ئەم جەنگە لایەکی بە لایەک دەبوو و دەبڕایەوە.
**سەربازی دووەم:** ئەگەر مەبەستت ئەوە بێ کە لە داهاتوودا ئێمە سەردەکەوین، ئەوا بەراستی، ئێمە لەم جەنگە ناماقووڵەدا گەر بشبەینەوە هەر دۆڕاوین.
**سەربازی یەکەم:** ڕاستییەکەی، برادەر، من تێناگەم.
**سەربازی دووەم:** لە چی ؟
**سەربازی یەکەم:** ( بە سەرسوڕماوییەکی پڕ لە ڕقەوە) لەم وشانە: بردنەوە، دۆڕان... سەرکەوتن، ژێرکەوتن.
**سەربازی دووەم:** چەند وشەیەکن، گشتیان بۆ یەک مەبەست بەکار دێن: باخەڵ پڕکردنی خۆیان، هەروەها شەکەتکردن و ئازاردانی خەڵکی بێگوناهـ .
**سەربازی یەکەم:** من نازانم ئەم جەنگە لەسەر چیشە !



**سەربازی دووەم:** ( بە ڕقەوە) هەن کە دەزانن.
**سەربازی یەکەم:** مامۆستایەکی دراوسێمان ـ خوا لێی خۆش بێ، لەو ئیجازەیەی پێشوومدا بیستم لە سێدارەیان دابوو ـ دەیگوت: " ئەم شەڕە، هەمووی بۆ ئەوەیە کە فرۆکە و تەقەمەنی و چەکی قورسی.. نازانم هی کام وڵات.. بخەنە بازاڕەوە و بیانفرۆشن"؛ دەیگوت: " بۆئەوەیە کە ئەم دوو وڵاتەی ئێمە ببنە بازاڕێک بۆ قازانجی .. ( بۆ ناوی وڵاتەکە دەگەڕێ).
**سەربازی دووەم:** ئەمریکا ؟
**سەربازی یەکەم:** نەء .
**سەربازی دووەم:** فەرەنسا ؟
**سەربازی یەکەم:** ئا.. ئا، بەڵێ.
**سەربازی دووەم:** بەڵام تەنیا بۆ ئەوە نییە، بۆ شتی دیکەشە؛ شتی دیکەش هەن کە لەسەری بەشەڕ دێن.
**سەربازی یەکەم:** شتی چۆن ؟ چی ؟
**سەربازی دووەم:** بڵێم شتی چۆن ! ( بە ڕقەوە) شتی ناماقووڵی ئەوتۆ مەگەر تەنیا شەیتان دەستی تێ بچێ. بەپێی قسەی ئێزگەکان لەسەر ئەو پارچە عەردەی باشوورە.
**سەربازی یەکەم:** کام پارچە عەرد ؟
**سەربازی دووەم:** ئەو پارچە عەردەی، ئەگەر خۆ ئێمە وەدەستیشی بهێنینەوە، یەکسەر دووای مانگێک، دەکرێتە سامناکترین زندانی ئەشکەنجەدانی بێ تاوانان ( بە دوودڵییەوە) بەڵام بڕواش ناکەم، ناگونجێ سێ ساڵی خوێن ڕشتن تەنیا سەبارەت بە پارچە عەردێک بێت ! ( بە تەوسێکی بێهوودەییەوە) بەڵام بۆ نا ؟ خۆ سەیریش نییە ! مرۆڤ لەم ڕۆژهەڵاتەدا زۆر کەر و کەودەن و بێ عەقڵە؛

تەنانەت لەوانەیە لەسەر پارچە ئێسقانێکی سووتاویش بەشەڕ بێ ! سەرۆک حزب و سەرکردەکانمان، خۆ لە خەڵکە ساکارەکە زۆر بێ عەقڵ و چڵێستریشن.

(تاوێک بێدەنگی)

**سەربازی یەکەم:** تۆ بڵێی وا زوو کۆتایی پێ بێ ؟

**سەربازی دووەم:** باوەڕ ناکەم ( وێستێکی کەم) بەڵام خۆ لەوانەشە: چونکە ئێستا خەڵکەکەیان بەتەواوەتی شەکەت کرد و توانیشیان هەموو پارتەکانی دیکەی غەیری خۆیان لاواز و پارچەپارچە بکەن !

**سەربازی یەکەم:** ( وەک ئەوەی یەکەم جار بێ لە ژیانیدا گوێی لەم وشەیە بووبێت) پارت ؟

**سەربازی دووەم:** بەڵێ ئا، ئەو پارتانەی کە هەر لە سەرەتاوە بەرگرییان لە شەرەف و ژیان و ئازادیی خەڵک دەکرد و جەماوەرێکی زۆریان بەدەور کۆببۆوە. ( بێهوودانە) هەر چۆنێ بێ.. با ئێمە سەرمان بەم قسانەوە نەیەشێنین. بە گوێرەی ئێمە: ئەم شەڕە نەگریسە ئەگەر زوو کۆتایی پێ بێ یان درەنگ، تازە تەواو، ژیانی ئێمە فەوتا؛ ئێمە ئیتر تازە ناتوانین چاومان بە شاری خۆمان بکەوێتەوە !

**سەربازی یەکەم:** بەراست ؟

**سەربازی دووەم:** مەگەر تەنیا بەوەی کە تەسلیم بە هێزەکانی خۆمانمان بکەنەوە !

**سەربازی یەکەم:** ئێ ئەو کاتەش دیارە چارەنووسمان بە چی دەگا !

**سەربازی دووەم:** بڕوا ناکەم.

**سەربازی یەکەم:** من دڵنیام.

**سەربازی دووەم:** لە چی ؟



**سەربازی یەکەم:** لەوەی کە هێزەکانی خۆمان گوللەبارانمان دەکەن، یانیش لەسێدارەمان دەدەن.

**سەربازی دووەم:** من ئەوە ناڵێم؛ مەبەستم ئەوەیە کە بڕوا ناکەم تەسلیمی هێزەکانی خۆمانمان بکەنەوە.

**سەربازی یەکەم:** بۆچی ؟

**سەربازی دووەم:** چونکە ئێمە ئەو کاتە حسێبی پەناهەندەییمان بۆ دەکەن، دەتوانین کە بەدووای ژن و منداڵەکانمان بنێرین، بەنهێنی بێن بۆ لامان و دەرباز بین بۆ دەرەوە، بۆ ئەورووپا، بۆ هەر وڵاتێک بمانەوێ.

**سەربازی یەکەم:** ( بە نیگەرانییەوە بەو ناوەدا دێت و دەچێ) بڵێم چی برادەر گیان، من هیچ شتێکی چاک لە بەختی خۆم رانابینم. چارەنووس و داهاتووشم، زۆر رەش، وەک ئاوێنەیەکی تەڵخ دەبینم ( وێستانێک) چی بکەین! جێی داخە کە مرۆڤ لە سەر ئەم زەوییە پان و پۆڕ و فراوانەدا شوێنێک نەبێ ئۆقرەی تیا بگرێ؛ جێی داخە بۆ ئێمە ـ کە هێشتا تێر بۆنی زەویمان نەکردووە و تێر دونیامان نەبینیوە ـ بەو هەموو دەرد و مەرگەساتییەوە سەربنێینەوە. ئێمە دیارە لە چارەمان نووسرابوو، لە چارەمان نووسرابوو کە ئەم رۆژگارە پڕ بەلایە بە چاوی خۆمان ببینین. پێم بڵێ: جیاوازیی من چیە لەگەڵ ئەو خەڵکەی کە ئێستا وا لە شارەکاندا، لە خانووی خۆش و پەنجەرەبەنددا، لەسەر سیسەمی نەرم و نیاندا، بێ خەم پاڵ کەوتوون و خەونی دڵنیایی و پڕ رەنگ دەبینن؛ لەگەڵ ئەوانەی کە ئێستا وا لە سینەماکاندا، یانیش لە باڕ و کەبەریەکاندا، قاچ لەسەر قاچ دانیشتوون و بە مەستییەوە پێدەکەنن و فستق دەشکێنن.. جیاوازیم چی بوو؟ من لەگەڵ ئەوانەدا جیاوازیم چی بوو؟

بێگومان ئەوان هەنووکە منیان هەر لەبیریش نیە. من تەنانەت براکانیشم، ئێستا هەر یەکەو هەر خەریکی " ئۆتومبیل کڕین و فرۆشتنەوە" ی خۆیانن؛ هەر شەوەی لە بارێک، هەر شاوەی لە شارێک، لە قومارخانەیەک، لە ماڵێکدا یان دەعوەتن و یانیش مەستی مەی خواردنەوە و پارەژماردنن: کەی بواریان هەیە بیرێک لە من بکەنەوە ؟ خۆ پێش جەنگیش، کێ باری منی سووکتر دەکرد و بۆ خەمی من نەختێ دەسووتا.. کێ ؟ تەنها دایکم ( هەنسکی گریان قورگی دەگرێ) من لەناو شەڕیشدا، ئەو کەسەی کە زۆر زۆر بۆی پەرۆش بووم و بۆی دەگریام تەنیا دایکم بوو. من دڵنیام تەنیا تاسەی بینینەوەی ئەویش بوو کە لەم هێرش بردنەی ئەم شەودا وای لێکردم رابکەم و مردن بە خۆم بە ڕەوا نەزانم. گوناهە، گوناهە برادەر گیان! من، قەیناکە، با ژیانی خۆشم خۆش نەوێ، بەڵام ویژدانم چۆن قبووڵ بکا کەسێک دووای خۆم بە حەسرەت بکوژم.. چۆن ؟ بۆچی ؟ ( بە دەنگێکی گریاناوییەوە) من شەق دەبەم.. شەق دەبەم ئەگەر جارێکی تریش نەمبینێتەوە.. شەق دەبەم ئەگەر ئەو وابزانێ کە من مردووم و نامبینێتەوە !

**سەربازی دووەم:** تۆ خەفەت مەخۆ، خەفەت مەخۆ برادەر ! من لەوەدا بێگومانم کە بە دیداری دایک و بە دیداری کەسوکاریشت شاد دەبیتەوە. لەو ماوەیەی داهاتووی ژیانیشت، لە پەناهەندەییدا، ئینشاڵڵا هەرگیز بێ بەری و ئاتاج نابیت ! کێ دەزانێ؛ بەڵکو ئەم جەنگە هێندەی نەخایاند !

**سەربازی یەکەم:** ( بە خەمگینییەوە) سوپاست دەکەم؛ تۆ دەتەوێ دڵم بدەیتەوە.



**سەربازی دووەم:** نەخێر. تۆ هەرکە گەیشتیتە ئەوێ و ماوەیەکی بەسەرداچوو، وردە وردە ئەمانە بە چاوی خۆت دەبینی ( نەختێک بێدەنگی) هەر چۆنێ بێ، تۆ لەوێ یا لە هەر وڵاتێکی دیکەدا هەر ئیشێک بکەیت: ئەگەر دێوەرەیەکی بەینی شارەکانی کەنەدا بیت یان قاپشۆری چێشتخانەکانی ئەوروپا یا کرێکارێک بیت لە ئیتاڵیا، خۆ هیچ نەبێ تووشی هیچ بێ ئومێدی و رەنج بە خەسارییەکی وەک ئێرە نابیت.

**سەربازی یەکەم:** ئەرێ راستە دەڵێن " کارگەکانی لای ئێوە هەموویان داخراون" ؟

**سەربازی دووەم:** نەخێر.

**سەربازی یەکەم:** رۆژنامە و رادیۆ و تەلەفزیۆنەکانی لای ئێمە وای بڵاوەدەکەنەوە. تەنانەت دەڵێن " قوتابخانە و زانکۆکانیشتان هەموویان داخراون".

**سەربازی دووەم:** وایە، بەڵام یەکجار بەم شێوەیەش نیە. وەلێ تۆ لەبەرچی ئەم پرسیارە دەکەی ؟ کارگە هەبێ یان نەبێ، بە تۆ چی ؟

**سەربازی یەکەم:** ئاخر من ئەگەر بمەوێ لەوێ بە پەناهەندەیی بژیم، خۆ پێویستە ئیشێک بکەم.. هەر ئیشێک، پێی بژیم.

**سەربازی دووەم:** دڵنیا بە ! هێشتا کارگەگەلێکی زۆر ماون لە کاردا بن. ئیشیش یەکجار زۆرە، بەتایبەتی لە پایتەخت.

**سەربازی یەکەم:** کەواتە دەتوانم لەوێ بمێنمەوە و کاربکەم؟

**سەربازی دووەم:** خاوەن کارگە و قۆنتەراتچییەکان چما هەر هەست بەوە دەکەن کە جەنگیشە ؟

**سەربازی یەکەم:** ( بە سەرسوڕماوییەوە) لای ئێمە هەموو

ئەم شتانە بەپێچەوانەوە دەبیسترانەوە.
**سەربازی دووەم:** نەخێر. ئامریکا و فەرەنسا پارە و سامانێکی هێند زۆریان هەیە، تەنانەت دەتوانن تا حەوت سالانی دیکەش قەرزی بدەنێ. پاشان، جگە لەمە، تۆ لەوێ ئەگەر کاریشت بۆ نەدۆزنەوە، مووچەی مانگانەت بۆ دەبڕنەوە.
**سەربازی یەکەم:** ( سۆراغی قسەکەی پێشووی لێ دەکا، وەک ئەوەی کە بەتەواوەتی گوێی لە وشەکانی " ئەمریکا" و " فەرەنسا" نەبووبێ) وتت: کێ هەیەتی ؟
**سەربازی دووەم:** ئامریکا و فەرەنسا.
**سەربازی یەکەم:** ( بە سەرسوڕمانەوە) چما ئەمریکا و فەرەنسا پشتگیریی ئێوە دەکەن ؟
**سەربازی دووەم:** بەڵێ. ئێمە کەلوپەلەکانیشمان، تەنانەت بەشێکی زۆری خواردن و خواردنەوەکانیشمان هەر لەوانەوە بۆ دێت. هەڵبەت ئەمانیش هەر بۆ قازانجی خۆیان دەیکەن.. ئەگینا تۆ بیر بکەوە برادەر، ولاتێک چ مەجبووری ئەوەیە کە پاکەتێکی بچووکی جگەرەی ڕۆتمانمان لەو ڕێیە دوورەوە بۆ ڕەوان بکات؛ ئەگەر قازانجی خۆی تێدا نەبێ ؟
**سەربازی یەکەم:** سەیرە ! من لەبیرمە: جارێکیان گوێم لە ئێزگەی رادیۆی ئێوە گرتبوو، دەیگوت: ئەمریکا پشتیوانیی ئێمە دەکا نەک هی ئێوە. هەروەها مامۆستاکەی دراوسێشمان ـ خوا لێی خۆش بێ ـ هەر وای دەگوت.
**سەربازی دووەم:** باشە پێم بڵێ، برادەر، ئەی لای ئێوە ؟ لای ئێوە ژیان چۆنە ؟
**سەربازی یەکەم:** ئەرێ بەڕاست، تۆش جگەرەت پێ نیە ؟
**سەربازی دووەم:** من ناکێشم.



**سەربازی یەکەم:** لە پێری ئێوارەوە، جگەرەیەک چیە نەمکێشاوە ( نەختێک بێدەنگی. بە وەڕسییەوە) گەلێک سەخت و ئەستەمە، برادەر گیان ! هیچ شتێک لەوەدا نەماوە کە مرۆڤ پێی هەڵ بکا. شەمەک سێ نرخی جارانی خۆی هاتۆتە سەر. پارەش کەم و بێسوود بووە، تەنها لە دەست کۆمەڵێ گەواد و قۆنتەراتچی و دەوڵەمەندادایە و هیچی تر.
**سەربازی دووەم:** ئیش هەیە ؟
**سەربازی یەکەم:** بەڵێ ئەوە هەیە کە مەمرە و مەژی پێ بژیت. لە سەرەتادا چەند کارگەیەکی ناو شارەکان بۆردومان کران و داخران. هەروەها کرێکارێتیش ماوەیەک بوو دەست نەدەکەوت؛ ئەوەی هەشبوو، ڕۆژانەکەی زۆر کەم ببۆوە. ئیتر دووای ئەم هەشت مانگەش، نازانم. من لەوێ نەبووم. نەفرەتیان لێ بێ. توخوا برادەر، با واز بێنین. من هیچ توانای باسکردنی ئەم دۆزەخەم نەماوە ( وێستانێکی کەم) لە چاوان کوێر بن. چۆن ئەم ژیان و دنیایەیان تێک وپێک دا !

**سەربازی دووەم:** ( بیر لە قسەکانی برادەرەکەی دەکاتەوە و سەیری دەکا ) برادەر تۆ لەوە دەچێ کە حەزبکەی ولاتەکەت لەم جەنگەدا بدۆڕێنێ !
**سەربازی یەکەم:** نەک تەنیا من، ئێمەی خەڵکی بێتاوان هەمووومان؛ دووای ئەم جەنگە وێرانکارییە، بە یەکجاری ماڵئاواییمان لە واتاکانی " ولات " و " نیشتیمانپەروەری " کرد. واتاکانی " ولات" و " نیشتیمانپەروەری" بایانداوە کەندێ.
**سەربازی دووەم:** ولات ئەمڕۆ داردەستێکی ڕژێم و سەرکردەی حزبە بۆرژواکانە بۆئەوەی ولاتپەروەرانی بەدبەختی

وەکو ئێمە هەڵخەڵەتێنن؛ بەیەکترمان بەکوشت بدەن، قازانج و سامان و ئاسوودەییش تەنیا بۆ ئەوان بەجێ بهێڵین!

**سەربازی یەکەم:** ( بە دڵەڕاوکێوە، بۆ وەڵامێک دەگەڕێ) تێناگەم ! ( وەک دڵی خۆی بداتەوە) برادەر گیان، من دەمەوێ لە شوێنێکدا ئیشێک بکەم و بە ئاسوودەیی و تێری بژیم. ئیتر ئەگەر ئەمە، بۆ کرێکارێکی بەدبەختی وەک من، بە سەرکەوتنی وڵاتەکەی یان بە دۆڕانی بەدی بێت، وەکو یەک وایە ! وەکو یەک وایە ! ( بە بێزاری و ماندوویییەوە) وڵات، وڵات، وڵات! بە چی دەچێ ؟ من چەندین ساڵە لە وڵاتەکەی خۆمدا دەژیم و هەر برسیشم، هەر ماندووش، هەر بێ بەری و هەر نائاسوودەش. برادەر، وڵات: پارچە نانێکە کە پێی بژیت، وڵات: ماڵێکی بچکۆڵە و خنجیلانەیە کە لەگەڵ خێزان و منداڵەکانت بە ئارامی و بەختەوەرییەوە تێیدا بژیت. بەڵام لەکوێ برادەر؟ بەدبەختیی من ئەمەشم پێ بەرەوا نابینێ (بەبێهوودەییەوە ) تازەش تەواو. دووای چی ؟ کاتی بەسەرچوو. من ئێستا بێز لە خۆم دەکەمەوە. بۆ من، هەموو شتێک کاتی بەسەرچووە ! من هەرچی بڵێم خۆم هەڵدەخەڵەتێنم. ئاخ، دووریش نیە کە لەگەڵ وەرینی یەکەمین گەڵای ئەم پایزە تەسلیمی وڵاتەکەی خۆم بکرێمەوە (بەبێزارییەوە) خۆزگە !

**سەربازی دووەم:** ئۆف، برادەر، تۆ چەند ئەم ترسە وەبیرە خۆت دێنیتەوە !

**سەربازی یەکەم:** ( بێهوودە، هیچ قسەیەک ناکا)

**سەربازی دووەم:** ئەمە شتێکە کە قەت روونادا.

**سەربازی یەکەم:** تۆ راست دەکەی، بەڵام من دەڵێم لەم ساتە نالەبارەدا نابێ ؟



**سەربازی دووەم:** چی نابێ ؟

**سەربازی یەکەم:** دڵنیابوون.

**سەربازی دووەم:** دڵنیابوون لە چی ؟

**سەربازی یەکەم:** لەوەی کە ئایا تەسلیممان دەکەنەوە یان نا؟ ( بەتووڕەییەوە) لەوەی کە بژین، بێ مەرگەساتی و بێ چەرمەسەری: تەنیا ژیانێکی سادەی وەک مرۆڤ، هیچی تر نا! من دڵنیا نیم، من لەم شتانە و لە ژیانی خۆم هیچ دڵنیا نیم (بە فیگارییەوە) من چیتر توانای بیرکردنەوەم نەماوە.

**سەربازی دووەم:** ( قسە ناکا، بێدەنگ، سەیری برادەرەکەی دەکا)

(تاوێک بێدەنگی)

**سەربازی یەکەم:** ( بەبێهوودەییەوە) بەڵام دەشتوانین کە بێ ئەمەش هەر بەرێ کەوین !

**سەربازی دووەم:** بەرەو کوێ ؟

**سەربازی یەکەم:** بەرەو خۆ تەسلیم کردن.

**سەربازی دووەم:** بەڵێ. راستییەکەی، من لە هەڵاتنی خۆم پەشیمان نیم؛ لەوەش رازیم کە چیتر خەڵکی بێگوناهم نەکوشت. هێندەش بەسە کە ئێستا هەناسەیەکی پاک لەناو ئەم دەوەن و گژوگیا تەڕ و جوانانە بەسەربەستی هەڵدەمژم. ئەم قسە پڕ خەم جوانانەی تۆش وام لێدەکا کە ئێستا هەست بە بەختەوەرییەکی زۆر بکەم ( لەناکاو دەشڵەژێ، بەپەلە بەرەو لای برادەرەکەی هەنگاو دەنێ ) ئەوە چییە ؟ ( برادەرەکەی بە ئەزیەتەوە دەکۆکێ) ئەی بۆچی زوو دەنگت نەکرد ؟ (وێستانێکی کەم. لەبەر تاریکییەکە چاوی باش نابینێ، ورد دەبێتەوە) ئەم خوێنە چییە بە قۆڵتەوە ؟ برینداری؟

**سەربازی یەکەم:** (سەیری شوێنی خوێنەکە دەکا، وەک ئەوەی کە تازە خوێنەکەی سەر بەرگی خۆی دیبێ) نەخێر نە، (لەپڕ دەکۆکێ) هیچ نییە. وا دیارە خوێنی هاورێکانمە (وێستانێکی کەم) وشک بۆتەوە.

سەروبازی دووەم: ئەی چیتە ئەوە ؟ نەخۆش دیاری ؟

**سەربازی یەکەم:** نەخێر، نەء . هیچم نیە.

**سەربازی دووەم:** با، لەوە دەچێ سەرمات بووبێ (پاڵتۆکەی بەر خۆی دادەکەنێ. ئەو ئاگای لێ نیە) هانێ، بیکە بەرت !

**سەربازی یەکەم:** چی ؟ نەخێر، دەیکەیتەوە بەرت بە خوا.

**سەربازی دووەم:** نابێ ! پێتەوە دیارە، سەرمات بوو.

**سەربازی یەکەم:** ئاخر، تۆ خۆت سەرمات دەبێ.

**سەربازی دووەم:** نەء، نابێ ! من بە سەرما زۆر راهاتووم (یارمەتیی دەدا بۆ لەبەرکردنی پاڵتۆکە) ئەوە پەنجەت چیی بەسەر هاتووە ؟

**سەربازی یەکەم:** ( سەیری پەنجەکانی دەستەچەپی خۆی دەکا) بەر مەکینەی کارگە کەوت.

**سەربازی دووەم:** ( دادەمێنێتەوە و وردتر لە پەنجە قرتاوەکانی رادەمێنێ) هیچ پارەیان بۆ نەبڕیتەوە ؟

**سەربازی یەکەم:** مەبەستت خاوەن کارگەکەیە ؟

**سەربازی دووەم:** خاوەن کارگەکە، میری ؟

**سەربازی یەکەم:** ئاهـ برادەر ( وێستانێکی کەم. بە دەنگێکی کەساسییەوە) من خۆشم لە خۆم دەپرسم: بۆچی لای ئێمە هیچ نەقابەیەک یان پارتێک یان سەندیکایەک نیە کە ئاگای لە کۆست و چەرمەسەریی ئێمە هەبێ ؟ ( بە هەناسە ساردییەوە) پێیان وتم: " هیچ کرێکارێک لە کاتی پەڕینی پەنجەیدا پارەی وەرنەگرتووە تا تۆ وەریبگری".



**سەربازی دووەم:** گوێ مەدەرێ، برادەر. خۆ تۆ پاش ئەوە پەکت نەکەوت. ژنت هێناوە ؟

**سەربازی یەکەم:** بەڵێ. بۆ نەگبەتیم دوو منداڵیشم هەیە. یەکێکیان پێرار لەگەڵ خاڵی بەر قەسفێکی بەنزینخانەیەک کەوت. منداڵەکەم چاک بۆوە و خاڵەکەی گیانی سپارد. خۆ خاڵەکەیشی برینەکەی هێندە سەخت نەبوو، دەکرا نەهێڵین بمرێ. بەڵام یانی چی ؟ ئەوساتیش هەر بێهوودە بوو.

**سەربازی دووەم:** چی بێهوودە بوو ؟

**سەربازی یەکەم:** ئەگەر چاکیش بووبایەتەوە.

**سەربازی دووەم:** کێ ؟

**سەربازی یەکەم:** خاڵی کوڕەکەم.

**سەربازی دووەم:** بۆچی بێهوودە بوو ؟

**سەربازی یەکەم:** چونکە دیسانەوە بۆ مردنێکی دیکە ساغ دەکرایەوە: بۆ جەنگ؛ دەبووایە وەک ئێمە بێتە ئەم جەنگە نەفرەتلێکراوە. بەڵێ، ئەو بۆ خۆی مرد و ئەم ئەشکەنجەیەی ئێمەی نەدیت. ئەم بەختەوەر بوو کە بە پارچە زەوییەک راگەیشت و تیاي نێژرا. دەزانی: لە شاری ئێمە، ئێستا، خەڵکی وا هەن تەنانەت گۆڕیشیان دەست ناکەوێ کە مردووەکانیان تیا بنێژن ؟ زۆربەی دەوڵەمەندەکان بەم دوواییە خەریکی ئەوە بوون عەردیان بۆ گۆڕی خۆیان دەکڕی. ئەوە سەیری چی دەکەی ؟

**سەربازی دووەم:** ( چاوی بە ماتەمینییەکی قووڵەوە بڕیوەتە ئاسمان) ساماڵێکی چەند خەمناک و جوانە !

**سەربازی یەکەم:** ( سەرهەڵدەبڕێ و سەیری ئاسمان دەکا.پێکەوە رووەو ئاسمان رادەمێنن) سەیرە برادەر، بەڵام هیچ ئەستێرەیەک دیار نیە !

**سەربازی دووەم:** ئەستێرەش هەموویان داڕژاون. ئاه برادەر، دەبینی: ئەستێرەکانیش چەنێک بەزەییان بە حاڵی مرۆڤی ئێرەدا دێتەوە.

**سەربازی یەکەم:** دەڵێن " لەگەڵ کۆچکردنی هەر مرۆڤێک ئەستێرەیەک دادەڕژێ". ئەمە ڕاستە؟

**سەربازی دووەم:** ئەگەر ئەمە ڕاست بووایە، دەبوو ئێستا ئاسمان سەرتاپای بووبایەتە تنۆکە فرمێسکێک و داباریبا (بەسەرسامییەوە چاو دەگێڕێ) ئەستێرەیەک نیە بجریوێنێ ! مەلێک، باڵندەیەک نیە بخوێنێ ! ئێرە دنیایەکی چەند خامۆش و ترسناک و پڕ غەمگینییە ! دەزانی برادەر: من لەم دیمەنە تاریک و سامناکانەشدا جوانییەکی نامۆ دەبینم. لەڕاستیدا، دیمەنە ترسناکەکانیش جوانییەکی تایبەتییان هەیە، دەزانی ؟ تۆ سەیرکە ( چاوی بڕیوەتە مانگ) تەنانەت مانگیش.. چەند کز و کەساسە ! بۆ وا بەزەردی دەدرەوشێتەوە ؟

**سەربازی یەکەم:** ( ماوەیەکە بە قسەکانی برادەرەکەی حەپەساوە و سەیری مانگ دەکا) برادەر، لەوانەیە ئێستا، لەم شەوە ناوەختەدا، تەنیا من و تۆ بین سەیری مانگ بکەین.

**سەربازی دووەم:** بەڵێ برادەر، خەڵکی شار ئێستا، هیچ یەکێکیان ئەو برین و کەساسییەی مانگ نابینن. ئەوان ئێستا لە شیرین خەودان.

**سەربازی یەکەم:** ئەرێ ئەوە چییە ؟ ( بەحەپەساوییەوە سەیری شتێک دەکا کە لە ناوەڕاستی شانۆدا کەوتووە) ئەو دەمانچەیە هی تۆیە لەوێ کەوتووە ؟

**سەربازی دووەم:** ( ئاوڕ بۆ شوێنی دەمانچەکە دەداتەوە) هی من ؟ نەخێر. من هیچ دەمانچەیەکم پێ نەبوو (دەچێتە



پێشەوە و سەیری دەکا ) دەمانچە نیە.

**سەربازی یەکەم:** ئەی ؟

**سەربازی دووەم:** یەدەگە (هەڵی گرتۆتەوە و لێی ڕاماوە).

**سەربازی یەکەم:** لەوانەیە لە جەنگاوەرێک بەجێ مابێ ؟

**سەربازی دووەم:** بەڵێ. سەیرکە: ئەو هەموو ژەنگەی هەڵی هێناوە ! لەوە دەچێ کە بارانـاوی ڕۆژگارێکی زۆری بەسەردا ڕژابێ !

**سەربازی یەکەم:** دیارە پێش من و تۆش هی دیکە هەبوونە کە ئەم ڕێگەیان پەی کردبێ ؟

**سەربازی دووەم:** لەوانەشە هی قاچاغچییان بێت. قاچاغچی نەبێ، هیچ کەسێکی دیکە پەی بەم شوێنە لاتەریکەی ئێمە نابا ( یەدەگەکە هەڵگێڕ و وەرگێڕ دەکات و لێی ورد دەبێتەوە) ئاخ برادەر، خۆزگە دەتزانی ئەم یەدەگە چیم بیر دێنێتەوە ! (خۆشی و زەردەخەنەیەک سەری پێ هەڵدەبڕێ. بەدەم هەنگاونانی لەسەرخۆوە، بە خەمباری و خەیاڵاوییەوە) بیرمە منداڵ بووم، تەمەنم حەوت هەشت ساڵێک دەبوو. باوکم بەردەوام لەم جۆرە یەدەگ و چەکانەی دەهێنایەوە ماڵ. باوکم لە تەنیشت خۆی دادەنام و منیش کونجکۆلانە سەرنجی دەست و پەنجەکانیم دەدا. خۆزگەم هەر بەو سات ! من هەر لە منالییەوە، فێری بەکارهێنان و چاککردنەوەی هەموو جۆرە چەکەکان ببووم، ناوی گشتیانم یەک یەک دەزانی. هێند پەرۆش و هۆگریان بووم، تەنانەت گەمەکانیشم هەر لەگەڵ ئەم چەکانە بوو. ئاخ، برادەر، بەڵام ئێستا ئەم جەنگە هەموو چەکێکی لەپێش چاو خستم؛ تەنانەت وای لێکردم بێز لە باوکیشم بکەمەوە کە هێند بایەخی بە چەک و تەقەمەنی دەدا. من تەنیا ئێستا لە

هەقیقەتی چەک و مەرگەساتی چەک تێدەگەم. بەڵام خۆ، ـ من ئەوساش هەر... سەیرە ! لەوە دەچێ کە مرۆڤ هەر لەو ساتەوەی لەدایک دەبێ، سروشتی خۆی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبێ. بەڵێ. من ئەوساش قەت نەمدەتوانی خۆم لە بەر دیمەنی سەمای مەرگی تەنانەت سوێسکەیەکیش رابگرم. بەزەییم بەو کەوانەدا دەهاتەوە کە لەگەڵ باوکم بە ساچمە دەمانکوشتن. پێم ناخۆش بوو ئاسکێک ببینم لە گیانەلادا. باوکم پێی دەگوتم: " تۆ منداڵێکی ترسنۆکی، کە گەورە دەبیت زەلامێکی بەدبەخت و ناتەواوت لێ دەردەچێ !".
بەڵێ، هەر واش بوو: کە وردە وردە هەراشتر بووم، خۆم لێی دەدزیەوە و نەدەچوومە راوە سوێسکە و ئاسکەکانی. دەچووم لەگەڵ منداڵە شرۆڵەکانی گەڕەک، لە ئاقارەکاندا بەدووای سەگ و کەرە پشت گوڕووەکاندا دەکەوتین، یانیش دەچووین لەسەر گوفەک و لە پشت حەسارە گەورەکاندا وازیمان دەکرد، گوجیلەی ناو نۆینی حەمامەکانمان دەردەهێنا. ئاهـ چەندم خۆش دەویستن، چەندم کەیف پێ دەهاتن ! چاوشارکێ و حەفت پاتریانێ و قەرەتۆپ و یەکتر راوەدوونانی ناوکۆلانە رەشەکانی گەڕەکی خانەقا، پرتەقاڵ دزینی گەڕەکی ناوقەسران.. هەموو شتێک، هەموو شتێکی ئەم ژیان و ئەم دنیا پاک و جوانەی منداڵیم چەند خۆش دەویست ؟ ئاهـ ، منداڵی، منداڵیی کۆن و بەهەدەرچووم، ژیانم تێتدا چەند خۆش دەویست ؟ ئەوەیە: ئاخر ئێمە، ئێمەی منداڵانی ناو گەڕەکە رەش و خانووە قوڕینەکان، کاتێ گەورە دەبین، هیچ شتێک نیە بە ژیانمان ببەستێتەوە: جگە لەو خۆشەویستییە کۆنەی کە لە سەردەمی منداڵییەوە بەرامبەر ژیان پێی راهاتبووین؛ تەنیا خۆشەویستیی راهاتووی سەردەمی



منداڵیمانە کە بە ژیانی بێ مانا و ناخۆشی سەردەمی گەورەییمان دەبەستێتەوە ( لە بەر خۆیەوە، وەک وڕێنە بکا ) ئەگینا من، تێناگەم: چۆن بەم هەموو دەردەسەری و مەرگەساتەوە هەر ماوم و هیوام بە ژیان هەر ماویشە؟ چۆن! ئەو ژیانە بێزەوەر و پڕ حەسرەتەی من تێدا ژیام، ژیانێکی وا نەبوو کە هیچ هیوا و خۆشەویستییێکم بەرامبەر ژیان پێ بهێڵێتەوە. برادەر، من هەر لەدووای نەمانی باوکم ئیتر ژیانم لێ بوو بە دۆزەخ. وا بزانم ئەو کات تەمەنم پانزە ساڵێک دەبوو. کە باوکم مرد، نەمهێشت چوار خوشک و براکەم، تەنیا دایکم بە کۆڵکەری و نانکەری بەخێویان بکا: چووم ماوەیەکی زۆر کرێکاریم کرد، بۆیەچێتیم کرد، لە گازینۆ و چێشتخانەکاندا بووم بە شاگرد.. هەزاران جەربەزەیی و نوگمەساری و دەرد... ئەمانە هەمووی لەپێناو کێ ؟ لەپێناو کێ برادەر ؟ لەپێناو دایکم، لەپێناو خوشک و براکانم؛ لەپێناو ئەو چەند مرۆڤە خۆشەویستەی کە ـ دووای ئەوەی بەخێوم کردن و گەورەم کردن ـ ، ئێستا تەنانەت هیچ ناونیشان و هەواڵێکیشیان نازانم ! کامەران نەبێ کە توانیی لەم وێرانەیە رزگاری بێت و بۆ خۆی بگاتە هەندەران. لە سوێدەوە نامەیەکی بۆم ناردبوو، نووسیبووی " لێرە ژیان گەلێک خۆشە. گەر حەزدەکەی خۆشت و منداڵەکانیشت وەرن". بەڵام ئاهـ ، کامەران.. بەچی ؟ چۆن ؟ خۆ پاش تۆ، یەکسەر، هەرچی سەر سنووری وڵات هەبوون، گشتی بە چەقۆ و سەگ و پۆلیس تەنران؛ تەنانەت بواری پەپولەش نەما رزگاری ببێ ! تەنیا دەوڵەمەند و پارەدارەکان دەیانتوانی ئەم وێرانە کاولبووە جێ بهێڵن ( وێستانێکی کەم ) ئاهـ ئەفسووس، ژیانی من بۆچی بەم ئەنجامە تاڵە گەیشت ؟ خۆ

بەس تەنها ساڵێک بوو کە بەرگی سەربازیم داکەندبوو، دووبارە جلی سەربازییان کردەوە بەرم .. ئاخ .. من خەفەتم بۆ تۆیە غەریبە ، ئەی ژنە چاک و کەساسەکەم ! ئەو رۆژەی کە ناوم هات و جلە سەربازییەکەیان لەبەرکردم، رۆژێکی چەند تاڵ و پڕ پرسە بوو بۆ تۆ؛ رۆژێکی چەند پڕ خەم و پڕ گریان و پڕ حەسرەت بوو ! ئاخۆ ئێستا تۆ بەم نیوەشەوە چی دەکەی غەریبە؟ لەوانەیە خەوتبیت و ئێستە خەونم پێوە ببینی! ئاهـ غەریبە.. ! ئاخۆ لەدووای ئەم هەموو مانگە بێ من چیت بەسەر هاتووە ؟ ئایا ئێستا چیت بەسەر دێ گەر بزانی: منیان یەکسەر لەگەڵ فەوجەکم ـ بە فرمانێکی زۆر کتوپڕ، بە هەلیکۆپتەر ـ راگوێستەوە بۆ سەر سنووری شەڕ ؟ چیت بەسەر دێ گەر بزانی: بە درێژایی ئەو هەموو مانگە ئاو بە لەشم نەکەوتووە؛ هیچ ژەمێکم بە ئاسوودەیی و تێر بە سکی خۆم نەخواردووە ! ئاهـ ، خۆزگە ئێستا بەم تۆپەڵە ریشەوە و بەم دژوێنی و شەکەتییەوە چاوت پێم دەکەوت ! ئاخۆ غەریبە، ئێستا دەزانی کە وام لەم جەنگەڵە سامناکەی سەر سنوور و بێ تۆ و بێ چاوانی ئاڤا خەریکە وا گیان دەدەم ؟ دەزانی ؟ ئاهـ ، غەریبە، من دەزانم: تۆ ئێستا گومان لە لە دوواکەوتن و نەگەڕانەوەم دەکەیت؛ لەوانەشە دڵت ختووره بکات و بڵێی: '' تازە تەواو.. ناگەڕێتەوە''. دەزانم: تۆ ئێستا هەمیشە بسک و کەزییەکانت پەشۆکاون. ئێستا ئەو زەردەخەنەیەی کە هەمیشە روومەتی چاڵ دەکردیت و روخسارتی دەدرەوشاندەوە، لە ناختدا کوژاوەتەوە. من دەزانم: تۆ ئێستا زۆر خەمناک و زۆر پرسەداری: ئەو کراسە قاوەییە گوڵڕەنگ ئاڵەی کە من هەمیشە حەزم دەکرد لەبەری کەی، لەبەری ناکەی؛ ئەو دوو چاوە وەک دوو فنجان پڕ



قاوانەی کە من هەمیشە حەزم دەکرد کلڕێژی کەی، کلڕێژی ناکەی. ئێستا هەرگیز وەک جاران بەو گۆرانییە خۆشیبەخشانەی رادیۆکەوە، بەدەم گسکدانی حەوشەکەوە ناکەویتە لەنجە و ناز و سەربادان؛ قەتیش وەک جاران بەدەم تەقەڵی لیفکەچنین و ساواربژارکردنەوە لەگەڵ ژنانی دەرودراوسێ بەو خۆشی و خەندەیەی جارانەوە دانانیشیت قسە و باس بکەن. نەء ، نەخێر، من دەزانم ئەی ژنە چاکە پڕ میهر و خەم و خەفەتبارەکەم ! دەزانم تۆ ئێستا لە ژوورە نووتەکەکەتدا، نێوچەوانت هەمیشە بە پەڕۆکێکی رەش دەبەستی و بە مەلوولییەوە هەڵدەکورمێی: چاو دەبڕیتە ئەو قۆچە ئاسکە هەڵواسراوەی قەد دیوارەکە؛ دەستی دوعا و پاڕانەوە بۆ ئاسمان، بۆ خوا بەرز دەکەیتەوە؛ بەڵکو ئەمە خوایە کە هێزی شەڕ و ناگەهانی لە ماڵەکە وەدوور رابگرێت و .. هاکا مێردەکەشت بگەڕێنێتەوە. ئاهـ ، غەریبە ! تۆ ژنێکی زۆر کەساس و زۆر کڵۆڵ بووی. ئاخۆ ئێستا کێ دەتپارێزێ ؟ کێ ئەو فرمێسکە گەرم و روونانەت لەسەر روومەت دەسڕێتەوە کە من وەختی خۆی، پێش ئەوەی بڕژێن دەمسڕینەوە ؟ کێ ئەو باوەشە نانەت بۆ دێنێتەوە کە من هەموو نیوەڕۆیەک راهاتبووم ـ لەسەر رێگەی گەڕانەوەی خۆم لە دایەرە ـ بۆتی بێنمەوە ؟ کێ لەو شەڕە شەقەی '' نەوت وەرگرتن '' نەختێ بەزەیی بە رەنجووریی تۆ دێتەوە و تەنەکە نەوتێکت بۆ وەردەگرێ ؟ کێ ؟ کێ ، غەریبە ؟ ئاخۆ غەریبە، ئەو خەونە جوان و رەنگینانەت لەبیر ماون: خەونی گەشتی ئەو هاوینەهەوارانەی کە دامانابوو بیانبینین، ئێستاو ئێستاش نەماندیتن؛ خەونی کڕینی ئەو تەلەفزیۆنەی کە حەزت دەکرد وێنەکانیت بە رەنگاوڕەنگی بەر چاو بکەوێ؛ خەونی

چوونە ناو خانووی نوێ؛ خەونی کڕینی سیسەمی نوێ،
مووبەقی نوێ... ئاهـ غەریبە.. تۆ هەموو جار دەتگوت: "
هەر پاش چەند ساڵێکی دیکەیە، لەو خانووە رزگارمان دەبێ.
ئەوسا تۆ بۆ خۆت ژوورێکی سەربەخۆت دەبێ، هیچ منداڵێک
لە خوێندنەوە جاڕست ناکەن". ئاخ غەریبە، کەی ئەو رۆژە
شیرینانە بە چاو دەبینین ؟ ئاخۆ ئەو پارەیەی کە سالانێک
بوو بەیەکەوە پێکەوەمان نابوو چی بەسەر هاتووە ؟ بێگومان
ئێستا هیچی نەماوە. بەلام قەیناکە؛ من دڵنیام: تۆ لە
گەرووی شێریشدا بیت، دەتدۆزمەوە و دەنێرم بە دووات.
رۆژێ هەر دادێ هەموومان پێ پەیدا بکرێتەوە و بتوانین
بژین. من خەفەت بۆ ئەوە ناخۆم. خەفەتی من بۆ ئازار و بۆ
دووریی تۆیە، بۆ ئەو دوو گۆنا شیرینەتە کە دەترسم تا پێک
دەگەین حەسرەت و خەم وەک دووگوڵی بێنازکەوتوو
بیانژاکێنێ. ئاهـ ، توخوا غەریبە، عومری شیرینی
پێکەوەییمان چەندە کورت بوو ( بەدەم قوڵپی گریانەوە)
چەندە کورت بوو ، چەن...دە ...کو...ر...ت...
**سەربازی یەکەم:** ( بە مەلوولییەوە لە برادەرەکەی نزیک
دەبێتەوە، بە حەسرەتەوە دەستی دڵدانەوە دەنێتە سەر شانی
برادەرەکەی، ئەویش لە شوێنی خۆی رادەچڵەکێ) بەسیەتی !
بەسیەتی برادەر ! تۆ بەم قسانە منت زۆر ئازاردا.
**سەربازی دووەم:** ( خاودەبێتەوە) ئاخ برادەر.
**سەربازی یەکەم:** تۆ زۆر سەیر لەم شتانە دەدوێی. دەڵێی
هەر لە هەموو ژیانت قەت باوەشی ژنت نەدیوە.
**سەربازی دووەم:** راست دەکەی برادەر. من لە هەموو ژیانمدا
قەت هێندە لە خۆشەویستی و باوەشی ژن نەدوواوم، هەرگیز.
من خۆشم سەیرم پێ دێت. من ئێستا ئەم شتانە وا دەبینم کە



دەڵێی یەکەم جارە لە ژیانمدا هەستیان پێدەکەم، دەڵێی یەکەم
جارە حەوجەیانم. ئاهـ خوایەکا ، مرۆڤ لە ساتەکانی
ئەشکەنجەیی و شکستیدا چەند ناسکتر دەبێتەوە، چەند
پەرۆش و ئاتاجی دەستەکانی غەیری خۆی دەبێ !
(وێستانێکی کەم) ئەوەیە برادەر، مرۆڤ لەم دنیا پڕ
مەرگەسات و چەرمەسەرییەدا گەر هەموو کەسێک و هەموو
شتێکیشی لەدەست بچێ، بەلام بەس بەوەی ئەگەر ئافرەتێکی
لەپشتدا بێ: قەت وەڕس نابێ و قەتیش نووچ نادا. ئەو
ئافرەتە زۆری بۆ من کرد. گەلێک خەم و ماتەمینیی سەخت
و کوشندەی لەبیر بردمەوە: ماتەمینیی برین و برسێتیی
رۆژانی رەشی منداڵی و گەنجیم؛ ماتەمنیی ئەو رۆژگارەی کە
نەک تەنیا من.. برادەران و سەرازایان گشت.. لە داخ
حەسرەتی کۆستێکی گەورە و رەش و نەگبەتدا خۆیان
تێکدەشکاند و لە قەهراندا تفیان لە خەبات و تێکۆشان و
کوردستان دەکرد؛ ماتەمینیی ئەو ئازیز و هاوڕێ و مەردانەی
کە هەڵواسران یانیش یەک بە یەک راوەدوونران، ئێستا
نادیار، بێ سەروشوێن، لە ولاتان کەوتوون؛ ماتەمینیی ئەو
سێ مانگەی بێ هیچ بەڵگەیەک وەک سەگ خرامە نێو
زیندانێکی تاریکەوە و ئەنجن ئەنجن کرام.. زۆر خەمی تر،
بەم مرۆڤە دڵ پڕ میهر و گەورەیە نەبووایە لە دڵی مندا
سووکتر نەدەبوون. تەنانەت ئێستاش، من متمانەم لەم دنیا
بێ قەول و قەرارەدا بە هیچ شتێک نەماوە: تەنها بە سۆز و
میهری ژن نەبێ. مەزنترین کات و مەزنترین بڕوا، مەزنترین
دالدە: ئامێزێکە کە سەری کاسم بگرێتە خۆی، سەری کاس و
پڕ مەینەتیی ئەم هەموو سالەم. برادەرگیان.. راستییەکەی:
خۆ من ئەگەرچی (دەنگی دەسرێژ بەرزدەبێتەوە و قسەکەی

پێ دەبڕێ. هەر دووکیان دەشڵەژێن: خۆیان لەپەنای گابەردێکدا حەشاردەدەن: بێدەنگ. تەقە تۆقێنەرەکان بەردەوامن).

**سەربازی دووەم:** ( بەئەسپایی و بەحەپەسانەوە، وردە وردە ملی لە پەنا گابەردەکەوە بەرزدەکاتەوە و دەیەوێ هەڵسێتەوە و چاو بە شوێنی تەقەکاندا بگێڕێ).

**سەربازی یەکەم:** ( بەپەلە رایدەکێشێتەوە سەر زەوی) دەتەوێ چی بکەی، بەدبەخت ! سەرت نەوی بکە، زوو ! (دایدەهێنێتە خوارەوە و پێکەوە لە پەنا گابەردەکە لەسەر سک رادەکشێن تا ئەو کاتەی تەقەکە ئەهوەن دەبێتەوە، پاشان بەبێدەنگی و ترسەوە هێور هێور هەڵدەسنەوە) دەزانی برادەر، دەبووایە ئێمە بەرێ بکەوتینایە و ئێرەمان بەجێ هێشتایە ! (لەبەر خۆیەوە) بەڵام سەیرە خۆ دنیا جارێ هێشتا تاریکە، زەردەیەکیش چیە بە دەرەوە نیە ! ( نەختێک بێدەنگی) ئەمە سێیەمین هێرشە کە هێزەکانی ئێوە لە ماوەی ئەم هەشت مانگەدا دەیکەنە سەر ناوچەکانی ئێمە.

**سەربازی دووەم:** بەڵام خۆ جارێ کاتی دیاریکراوی هێرشەکە ماویەتی ؟

**سەربازی یەکەم:** ( لەگەڵ خۆیدا ) بڵێم چی !

**سەربازی دووەم:** زۆریش لێمانەوە دوور نەبوو !

**سەربازی یەکەم:** لەوانەیە دەنگی تەقەی ناوچەی دیکە بووبن.

**سەربازی دووەم:** هەر چۆنێ بێ، بڕواناکەم هی ئەو هێرشە تازەیە بن کە خۆیان بۆ ئامادەکردووە.

**سەربازی یەکەم:** تۆ بڵێی وا زوو دەست پێ بکەنەوە ؟

**سەربازی دووەم:** گەر دەست پێ بکەنەوە یان نا، گرنگ:



من و تۆ پێش سەعات شەش هیچ یەکێکمان نابێ لێرە بمێنین.

**سەربازی یەکەم:** چما سەعات شەش هێرش دەهێنن؟

**سەربازی دووەم:** بەڵێ.

**سەربازی یەکەم:** بە ئێمەیان وت کە دەبێ هەر لە کاتژمێر چوارەوە خۆمان ئامادە بکەین !

**سەربازی دووەم:** سەعات چەندە ؟ سەعاتت پێیە ؟

**سەربازی یەکەم:** پێم بوو، لە ئیجازەی پێشوومدا لە ماڵەوەم بەجێهێشت.

**سەربازی دووەم:** بڕوا ناکەم سەعات لە دووی تێپەڕ کردبێ.

**سەربازی یەکەم:** کە سەربازێک دەکوژرا، یەکسەر پەلاماریان دەدایە، سەعات و ئەنگوستیلەکەیان لە دەست دادەپچڕین و بۆ خۆیان گل دەدایەوە.

**سەربازی دووەم:** بێ نمەک و بەدفەڕ !

**سەربازی یەکەم:** بە من: چاکیان دەکرد.

**سەربازی دووەم:** چۆن ؟

**سەربازی یەکەم:** ( بەبێهوودەییەوە) ئەم سەعات و ئەنگوستیلانە بۆ ئەم هاوڕێ سەربازانەیان بووایە باشتر بوو.

**سەربازی دووەم:** بۆ ؟

**سەربازی یەکەم:** چونکە ئەگەر ئەمانیش نەیانبردایە عەریف و ئەفسەرە گەورەکان پاشتر هەمان کاریان دەکرد. ئەم بێ ئینسافانە، دووای هەر هێرشێک، یەک یەک بەسەر لاشەی سەربازەکاندا دەگەڕان.

**سەربازی دووەم:** بە راست برادەر پارەت چەند پێیە؟

**سەربازی یەکەم:** بۆ چیتە ؟

**سەربازی دووەم:** زوڵمە ئەو پارەیەی پێمانە بە خەسار بچێ.
**سەربازی یەکەم:** بیگۆڕینەوە ؟
**سەربازی دووەم:** بۆ نا ؟
**سەربازی یەکەم:** ( دەست دەنێ بە باخەڵی خۆیدا ) تۆ چەندت پێیە ؟
**سەربازی دووەم:** ( دەست لە باخەڵی دێنێتە دەر و هەندێ پارەی کاغەزی دەداتێ) هەر چەندێک بێ، لەوانەیە هەر لەسەر ڕێگە پێویستییەکت پڕبکاتەوە.
**سەربازی یەکەم:** ( هەندێ پارەی دەرهێناوە و دەیخاتە دەست برادەرەکەی، بەڵام چاوەکانی ئەبڵەق بە خەمناکییەوە بڕیوەتە رەسمی ژنێک لەناو دەستی خۆیدا. وەک ئەوەی هەنسک بدا ).
**سەربازی دووەم:** ئەوە چیتە برادەر، دەم و چاوت لەبەرچی وا سوورهەڵگەڕا ؟ چیتە ؟
**سەربازی یەکەم:** ( سەری هەنسکدان  بە قوڵپی گریانەوە بەرزدەکاتەوە)
**سەربازی دووەم:** ئەوە بۆچی دەگری برادەر ؟ ( ملی لاردەکاتەوە و سەیری رەسمەکەی ناو دەستی برادەرەکەی دەکا) ئەمە رەسمی ژنەکەتە ؟
**سەربازی یەکەم:** ( وەک بخنکێ) بەڵێ، ئا.
**سەربازی دووەم:** مەگری، برادەر !
**سەربازی یەکەم:** ئاهـ ، برادەر ( بە غەمگینییەوە) من بۆ هیچ ناگریم. لەدەست بێ ویژدانیی خۆم دەگریم ( وەک ئەوەی لەگەڵ خۆیدا قسەبکا) لەم ئیجازەیەی دووایيمدا، لە حەژمەت قەهری خۆمدا دیسانەوە چەندین قسەی ناشیرینم



پێی گوت. بەس لەسەر ئەوەی کە بێ من چووبوو بڕێک پارەی لە قۆنتەراتچییەکی دراوسێمان وەرگرتبوو. ئاخر، من دەزانم: ئەو کابرایە چ ناکەسبەچە و بەدڕەفتارێکە ! بووە شەڕمان : قسەی ناشیرین نەما پێی نەڵێم. سەرباری ئەمەش ئەڵقەی پەنجەم داکەند و فڕێمدایە بەردەمی، پێمگوت: " ئیتر من دەڕۆم، نامبینیتەوە؛ تۆ بۆ خۆت مێردێکی دیکە بکەوە!". جەنتام بە شانمەوە کرد و ڕووی ئەم دۆزەخی جەنگەم گرتەبەر (وێستانێکی کەم) نەفرەتی لێ بێ ! بە درێژایی ئەو هەموو ماوەیە گوللەیەکم بەر دڵ نەکەوت و رزگارم ببێ: لەدەست خۆشم و لەدەست ئەویش.
**سەربازی دووەم:** چۆن دڵت هات پێتگوت: " مێردێکی دیکە بکەوە " ؟
**سەربازی یەکەم:** با !
**سەربازی دووەم:** ئەی ئەو گوتی چی ؟
**سەربازی یەکەم:** ( بەگریانەوە) نازانم وتی چی ؟ بەڵام دەیناسم. دەزانم ئەم بەدبەختە لە چ توخمێکە ! زوڵمە ! زوڵمە، برادەر !
**سەربازی دووەم:** نا، باوەڕ بکە ! دڵی ژن وەکو دڵی پیاو نیە. دڵنیابە: دایکی دوو منداڵ چۆن مێردی دیکە دەکاتەوە؟
**سەربازی یەکەم:** زوڵمە برادەر، ئەمە جێی داخە.
**سەربازی دووەم:** چی ؟
**سەربازی یەکەم:** ( بە بێزارییەوە) گەر شوونەکاتەوە. بۆ شوونەکاتەوە ؟ تازە دووای چی ؟
**سەربازی دووەم:** ( بەسەرسوڕماوییەوە) من زۆر سەیرم بە تۆ دێت ! ( وێستانێکی کەم) تەنانەت ئەو پیاوانەی کە بڕواشیان بە ژن و خۆشەویستیی ژن نیە، لە وەختی جەنگ و

نوشستیدا زۆر پەرۆش و حەوجەی ژن دەبن: کەچی تۆ ئەم ئافرەتە لەگەڵیشیدا ژیاویت، تۆ چۆن ویژدانت ڕێگەت دەداتێ ئەمە بڵێی !

**سەربازی یەکەم:** ( ماوەیەک لەتاو حەژمەت و بێزاریی خۆیدا قسەی بۆ ناکرێ)

**سەربازی دووەم:** تۆ چۆن بۆت دەکرێ ئەو هەموو یادگارە شیرینانەی خۆت لەگەڵیدا بیربچێتەوە ؟

**سەربازی یەکەم:** گوناهە. گوناهە، برادەر. من ئێستا خۆم چاک دەناسم. من ئێستا هەمان ئەو مرۆڤەی جاران نەماوم کە پێش دوو ساڵ لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانم دەژیام، هەروا ئەوەش نیم کە ئەوان چاوەڕێم دەکەن. تۆ دەمبینی: دێم و دەچم و قسەدەکەم، بەڵام کە سەیری خۆم دەکەم و بیر لە ژیانی رابردوو و ئێستای خۆم دەکەمەوە، بێز لە خۆم دەکەمەوە. برادەر، من لە خۆم دەپرسم: ئاخۆ چارەنووسم، بەم هەموو دەرد و مەرگەساتەوە، لە ناو ئەم ژیانە جەنجاڵ و ناڵەبارەدا بەرەو کوێ دەڕوا، بە چی دەگا ؟ ( وێستانێک. هەناسەی حەسرەت و بێهوودەیی هەڵدەکێشێ) ئاه برادەر، من تا یەکەم ساڵی جەنگیش بڕوام بەوە هەر مابوو کە ئەگەر جەنگ تەواو ببێ، ئەوا بە ئاسوودەییەوە دەگەڕێمەوە و لەگەڵ ژن و منداڵەکانمدا دەژیمەوە؛ بەڵام ئێستا، راستییەکەی، هیچ لەحزەیەک بە تەمای خۆم نیم، من هیچ ساتێک هەست ناکەم خۆم بم... ئەو مرۆڤە هێمن و ئاساییەی جاران. من ئێستا هیچ مانایەکی مرۆڤایەتی لە بوونی خۆمدا بەدی ناکەم. زوڵمیش لەو ژن و منداڵانە دەکەم ئەگەر ڕێگە بە خۆم بدەم جارێکی دیکە لەگەڵیاندا بژیمەوە. ئەوەتا من ئێستا پێش ئەوەی کە بگەڕێمەوە و خانەوادەکەم ببینمەوە، لەبەرچاومە:



ژنەکەم، منداڵەکانم، تەنانەت گشت دۆست و کەسوکارێکی دیکەشم.. دەیانبینم کە چۆن ژیانیان لێ تاڵ دەکەم و چۆنیش لە نێوان بەرداشی دەردەکانی خۆمدا دەیانپلیشێنمەوە؛ دەبینم برادەر (یەکسەر بە تووڕەییەوە) تەواو ! تەواو، برادەر ! من شایستەی ئەوە نیم کە چیتر لەگەڵ خێزان و کەسوکاری خۆمدا بژیمەوە. شایستەی ئەوە نیم ! با سزای گوناهەکانی خۆم تەنیا خۆم بیانچێژم؛ با بەس تەنیا خۆم دەربەدەر ببم.

**سەربازی دووەم:** تۆ بۆچی بەم شێوەیە بیردەکەیتەوە، برادەر؟ ( وێستانێکی کەم) من تا ئەم ساتەش وامدەزانی کە تۆ ژیانت خۆش دەوێت و دڵم زۆر بەو تروسکە ئومێدە خۆش بوو کە لە چاوە غەمگینەکانتەوە بەدیم دەکرد. چیە، ئێستا تۆ لەوە دەچێ کە بەتەما نەبیت ئەستێرەی هیچ هیوایەک لە ئاسمانی ژیانتا هەڵبێتەوە ؟

**سەربازی یەکەم:** برادەر، من هەست دەکەم خۆم هەڵدەخەڵەتێنم ئەگەر بەتەمای هیچ ئومێدێک بم. (وێستانێکی کەم) من دەترسم. من زۆر دەترسم، برادەر.

**سەربازی دووەم:** لە چی ؟

**سەربازی یەکەم:** لە هەموو شتێک، لە خۆم. تۆ سەیری چاوەکانم بکە: من لە ناو ئەو چاوانەی خۆمدا وەک گورگێکی برسی و پێکراو وام. من لەو گورگە برسی و پێکراوەی ناخی خۆم دەترسم، لەو ساتە فیگاری و نەفرەتلێکراوانەم دەترسم کە ئێستا تەنانەت خۆشم بێزیان لێ دەکەمەوە. ئاخر، تۆ ( بە دەنگێکی زەبوونەوە) ئەگەر لەو ساتە ترسناکانەدا ببینی، تەمای چیت بە ژیان و داهاتووی من دەمێنێ ؟ نازانم. زۆر سەیرە! من لەو ساتە سامناکانەی کە دەمگرێ، لە سەرەتادا سەرسووڕانێکی سەخت دامدەگرێ،

پاشان تایەکی قورس و بەتین جەستەم داگیردەکات و سەرتاپای لەشم ئارەقەیەکی گەرم دەردەکات؛ دەمارەکانی شان و ملم وەک چەند مارێکی ساتی گیانەلاً گرژدەبنەوە و رەپ رادەوەستن؛ چاوەکانم سوور، دەم و لیوم مۆر هەڵدەگەڕێن. ئاخ برادەر، من تەنیا خۆم دەزانم ئەم دەردە کوشندەیەم چیم بەسەر دێنێ ! لەو ساتانەدا وا هەست دەکەم کە هەر چی مرۆڤی سەر زەوی هەن بوونەتە گورگ و ددانیان لێم جیڕ کردۆتەوە و دەیانەوێ پارچەپارچەم بکەن، منیش لە حرس و حەژمەتی خۆمدا، گیانم وەک بورکانێک خەریک دەبێ بتەقێتەوە. هەر دوو چنگم وەک دوو چنگاڵی ئاسن لە هەر شتێکی بەر دەستم بکەوێ گیردەکەم و دەیانهەنجنم. ئاخ، برادەر.. ئێستا لەبەرچاومە کە دەڵێن " چۆن لەو ساتانەدا ددانم لە خەڵک جیڕدەکەمەوە و پێیان هەڵدەشاخێم و چنگی وەک چنگاڵم لە گەروویان گیردەکەم".

**سەربازی دووەم:** تۆ نەخۆشیی فێت هەیە !

**سەربازی یەکەم:** برادەر ( دەگری) ئەمە حەیفە. حەیفە کەسێکی وەک من سپێدەیەک لە خەو هەڵبستێتەوە و بە چاوێکی سوورەوەبووی پڕ لە خوێنەوە پەلاماری منداڵەکەی خۆی بدات و بیەوێ بیخنکێنێ ! حەیفە برادەر ! ئاخر من ئەم شتانەی کە پێم وتی، لەم ئیجازەیەی دووایيمدا لە ماڵەوەدا، لەگەڵ ژن و منداڵەکانمدا بەسەرم هاتن. لە گەرمەی خەودا یان لەسەر نانخواردن، لەناکاو، رەپێ دەبوومەوە و بەلەز پەلامارم دەدانێ و چنگم لە قورگیان گیردەکرد. من لەو ساتە سامناک و بەدفەڕانەی خۆم زۆر دەترسم. ئاخر ئەمە مەرگەساتە کە تۆ قاچت لە ماڵی خۆتدا بیت و سەریشت لە مەیدانی جەنگدا ! لەمە نەگبەتی تر لە دنیادا نابێتەوە



(وێستانێکی کەم، بە وەڕسییەکی پڕ لە ماندوویيەوە) من لەم ئیجازەیەی دووایيمدا هەستم دەکرد کە ماڵەوەم بەتەواوەتی هەراسان کردووە. من لە ماڵەوەدا هەمیشە ئەو ژنە بەستەزمانەم لەو گورگە پێکراوەی ناخم ئاگادار دەکردەوە. برادەر تۆش... تۆش ئێستا، لەم چەند ساتەی کە لای یەکترین ـ من قەت لە خۆم دڵنیا نیم ـ ؛ دەبێ ئاگادار بیت لێم ! دەبێ ئاگادار بی؛ نەوەک لەپڕ بتکوژم ! (چاکەتەکەی خۆی رادەپسکێنێ و بە ئازاردانەوە) ئاخ، برادەر! من ئێستا چ رووزەردییەک لە ناخەوە دەمهەنجنێ کە ئەم قسەیە دەکەم (بە تووڕەیی و هەم گریانەوە) ئەمە هەقیقەتی منە، برادەر؛ من دڕندەم. من دڕندەم. ( بە کزی و کلۆڵییەوە) من زۆر زەبوونم. من زۆر زەبوونم. ( دەگری ) من شایستەی ئەوە نیم کە پێم بڵێن" مرۆڤ".

**سەربازی دووەم:** نەخێر. نەخێر، برادەر. ( وێستانێکی کەم. پیش دەخواتەوە) خۆ نەک تەنیا تۆ، هەموو سەربازێکی ئەم جەنگە، تاکو چوار پێنج ساڵی دیکەش دەبێ هەمیشە ئاگاداری ئەوەی تەنیشت خۆی بکاتەوە ! بڕوا بکە: من مەبەستم ئەوە نیە کە دڵت بدەمەوە. ئێمە هەموومان لەمەودووا هەمیشە دەبێ ئاگادار بین لەیەکتری ! من بە قسەی مرۆڤێکی دڵپاکی وەک تۆ قەت سەغڵەت نابم. هەڵسە، مەگری، برادەر ! من دڵنیام هێندە نابا کە بە ژن و منداڵەکانی خۆت شاد دەبیتەوە و ئەو ساتە...

**سەربازی یەکەم:** ( ناهێڵێ قسەکەی تەواوبکات، بە وەڕسییەوە) بێهوودەیە. بێهوودەیە...

**سەربازی دووەم:** چی ؟

**سەربازی یەکەم:** هەموو شتێک. هەموو شتێک. تازە

تەواو؛ ئیتر وەرزی دڵنیایی و خۆشەویستی و مرۆڤایەتی بەسەرچوو. بەسەرچوو، برادەر ! تازە ئیتر هەموو شتێک تا هەتایە و بۆ هەمیشە تەنیا بۆنی خوێن و دەردیان لێ دێ. تازە ئیتر ئەو روومەت و لێوانەی ماچمان دەکردن تامیان لە تامی ئەو شەپڵە قورە زیاتر نابێ کە لەژێر تایەی دەبابەیەکەوە دەردەپەڕین و بە دەممانەوە دەنووسان، ئەو خەونانەی دەماندیتن وەک ئەو خەونە رەش و پڕ نەگبەتیانە دەبن کە لەژێر باڵی شەوی کوشتاردا دەماندیتن. ئەوەتا: من ئێستا پێش ئەوەی کە بگەڕێمەوە شارەکەم، دەبینم: کەسوکارم، خزمەکانم، دۆستەکانم، هەروەها گشت خەڵکی شار... لەجیاتی پێشوازی کردن، لەجیاتی ماچ و باوەشکردن، تفی شەرمەزاریم بە رووودا دەدەن. هەرگیز لە گوناهی ئەم چەندین ساڵی مرۆڤ کوشتنەم نابوورن. ئەوان، کاتێ دەگەڕێینەوە، گاڵتە بەو کۆششە بێهوودەیەی پڕ لە رەنجی جارانمان دەکەن. ئاسمانیش کە جاران جێی دڵنیایی بوو، ئیتر لەمەودووا هەر تەڵخی و غەوبار و هەر غەزەب دەبێ. تازە تەواو، ئیتر ئێمە ژیانمان تەنیا دەرد و مەرگەساتی و ماتەم دەبێ.

**سەربازی دووەم:** توخوا بەسە، برادەرگیان. تۆ قەت لە من خەمناکتر نیت. تکا دەکەم با بەس بێ ! با بۆ چەند ساتێک خەم و خوێن و مەینەتییەکان لەبیر خۆمان ببەینەوە. با بۆ چەند ساتێک، گەرچی کەمیش بێ، ئەوە لە بیر خۆمان ببەینەوە کە لە جەنگدا بووین.

**سەربازی یەکەم:** ( بە رقەوە) ئەم جەنگ نەفرەتلێکراوە ! تف ! ( بە تووڕەییەوە تف دەکاتە سەر زەوی) تەنیا تووشی ئەم دەردەی نەکردم، تەنانەت ویژدانیشی لەدەست دام. من قەت پێشبینیی ئەوەم نەدەکرد کە رۆژێ لە رۆژان مرۆڤێک



بکوژم و گوناهێکی هێندە گەورە بخەمە ئەستۆم. من لە رۆژانی پێش جەنگدا هەمیشە، هەموو پێشنوێژان، لەسەر بەرماڵی نوێژ و تاعەت، دەستەودوعا لە خوا دەپاڕامەوە کە لە گوناهە بچووکەکانم ببووری. ئێستا پێم بڵێ، برادەر: گوناهی کوشتاری ئەم چەندین ساڵەم، بە چی، چۆن دەشوورێنەوە ؟ چۆن ؟ ئێستا ئەگەر تەنانەت خوداش لێم ببووری، من بۆ خۆم هەرگیز لە خۆم نابوورم. هەتا دنیا دنیایە، هەر دەبێ بەم دەردەوە بتلێمەوە. ئاخر من چۆن بتوانم باز بەسەر ئەو هەموو گوناه و تاوانانەی خۆمدا بدەم ؟ من وا بۆ سێ ساڵی رەبەق دەچێ گورگێک بووم و ئامادە بووم هەرچی مرۆڤێک، هەرچی شتێ کە پێیان گوتبام '' لەناوی ببە !'' لەناوم دەبرد. دەیان مێردمنداڵ کە هێشتا بۆنی شیری خاویان لە دەم دەهات، دەیان گەنج کە هێشتا هیچ یەکێکیان بۆنی ژنیان نەکردبوو، من هەمووم کوشتن. سەدان مرۆڤی غەمگینی تر، کە تەنیا ئەگەر لە شاری مندا لەدایک بوونایە دەشیا بوونایەتە نزیکترین هاوڕێم. مرۆڤی کەساس و پیرەمێردی بەحورمەت و ریش سپیی ئەوتۆ کە بە باوکم دەشیان... قورم بۆ ماڵ و منداڵەکانیان گرتەوە... ئەمانە هەمووی لەپێناوی چی ؟ لەپێناوی کێ، برادەر ؟ ( بە رق و نەفرەتەوە) لەپێناو ژنێکی ئیبلیس و چەند منداڵێکی حەرامزادە، کە نەوەک حکوومەت بیانگرێت و دەربەدەریان بکات یان بیانخاتە بەندیخانەوە ! بەڵێ لەپێناو ئەواندا بوو کە من ئەو هەموو تاوانانەم کرد. سەبارەت بە ئەوان بوو کە من بوومە ئەم دڕندەیە ( بە گریانەوە) من پیاوکوژم، برادەر. من دڕندەم. من خوێنڕێژم، من تاوانبارم...

**سەربازی دووەم:** نەخێر، برادەر. تۆ پیاوکوژ نیت.

**سەربازی یەکەم:** ( بە گریانەوە) چۆن، چۆن برادەر ؟
**سەربازی دووەم:** نازانم؛ من لە چاوەکانتدا هیچ شتێ بەدی ناکەم کە پێم بڵێ تۆ هیچ کەسێکت کوشتبێ.
**سەربازی یەکەم:** دەزانم تۆ دڵم دەدەیتەوە، برادەر. بەڵام ئەگەر منت لە سەنگەری جەنگدا بدیبایە، بە تەواوەتی لەم رایەت پەشیمان دەبوویتەوە.
**سەربازی دووەم:** ئێمە، ژن و منداڵەکانمان لەم گوناهە گەورەیە بێ بەرین. لە گوند و شارەکانی ئێوەدا، چەند ژن و منداڵی بێ تاوان بوون بەژێر کەلاوەی تۆپ و قەسەفی فڕۆکەکانی ئێمە ؟ چەندیان ئێستا دەربەدەر، بێ دایک و باوک لە برسێتیدا دەتلێنەوە ؟
**سەربازی یەکەم:** ( بە حەسرەتەوە) ئەم شەو، هەر ئێستا، پاش دەمێکی تر، ژمارەیەکی زۆری دیکەش دەچنە پاڵ ئەمان. ئاخۆ ئەم شەو، لەم هێرشە تازەیەی ئەم شەودا، چەند ماڵی دیکە کاول دەکرێن ؟ چەند خوشک بێ برا، چند منداڵ بێ دایک، چەند باوک بێ منداڵ، چەند ژنی تر بێوەژن، چەند پیاوی تر بێوەمێرد دەکرێن ؟ ئاخ، ئەم شەو شێتی و ئاوارەیی و پرسە و یەخەدادڕانێکی زۆری دیکە بۆ ئەم خەڵکە رادەگەیەندرێت. ئەم مەرگەساتە بۆچی، برادەر ؟ لەپێناوی چی ؟
**سەربازی دووەم:** منیش تێناگەم ؟ ئەی کەواتە خۆشەویستی، شیعر، شارستانیەت لەپێناو چی ؟ بۆ کێ ؟ دۆزینەوەی مێکرۆبەکان لەپێناو چی ؟ سەیرە، برادەر، ئەم گرەوە چۆن دەبردرێتەوە ؟

لەناکاو، دەسرێژێکی تۆقێنەر بەرز دەبێتەوە: دەسرێژێکی



کەمخایەن، بەڵام لە نزیکەوە. هەر دووکیان دەشڵەژێن و تەنگەتاو دەبن.

**سەربازی یەکەم:** ( بە ترسەوە) وا دیارە هێرشەکە خۆیەتی! دەستی پێکرد ! ( دەیەوێ خۆی کۆبکاتەوە: بە دووای بێریە و قایشەکەیدا دەگەڕێ) با بەڕێ بکەوین، بڕۆین، برادەر ! ئەمەیان زۆر نزیکە. من دڵنیام ئەگەر هی هێرشەکەش نەبێ، ئەوا کاتی هێرشەکە زۆر نزیک بۆتەوە. با بڕۆین، ئەم ناوە جێ بهێڵین ! (تاکە تاکە تەقەی دیکە دەکرێ) با بڕۆین، با لە یەکتری جودابینەوە، برادەر گیان !
**سەربازی دووەم:** توخوا برادەر گیان، بەڵام پێش ئەوەی یەکتر جێ بهێڵین، تۆ دەبێ هەواڵی من بگەیەنیتە ماڵەوە ! وەرە .. ژمارەی تەلەفۆنی ماڵی پوورزاکەم ( باخەڵی خۆی دەپشکنێ).
**سەربازی یەکەم:** کەی ئێستا کاتی ئەوەیە ! برادەر گیان کاتی ئەوە نیە، توخوا؛ دەکوژرێی ! با ئێرە جێ بێڵین، زوو!

دەنگی سارۆخ و تۆپ و هاوەن بەرزدەبێتەوە. ئەو ناوە هەمووی دەبێتە یەک پارچە رووناکی. هەر دووکیان لە شوێنی خۆیاندا دەشڵەژێن و سەریان لێ تێکدەچێ: هەر یەکەیان خۆی لە سووچێکی جەنگەڵەکەدا حەشاردەدا. دیار نین لە کوێن ! تەنیا دەنگیان دەبیسترێ.
**سەربازی دووەم:** ( بانگی سەربازی یەکەم دەکا) جارێ نەڕۆی، برادەر ! بوەستە ! جارێ نەڕۆی، دەکوژرێی !

تەقەکە هەر بەردەوامە

**سەربازی یەکەم:** ( هاواردەکا ) ئەمە هێرشەکەیە، دەستی پێکرد. با بڕۆین، با ئەم ناوە بەجێ بێڵین !
**سەربازی دووەم:** ( هاوار) بەرەو کوێ ؟ رێگات لێ تێکدەچێ ! بەرەو کوێ دەڕۆی ؟
**سەربازی یەکەم:** ( هاوار) نازانم ! ئێرە کوێیە ؟ ئێمە لە کوێداین ؟ ( لەسەر شانۆدا وەدیاردەکەوێتەوە، وەک شێتێکی هەترەشچوو چاو بە ئاسماندا دەگێڕێ) ئێمە ونین. ئێمە ونین، برادەر ! من نامەوێ لەوە زیاتر لێرەدا بمێنمەوە. تۆ خۆت لە کوێ حەشارداوە ؟

**سەربازی دووەم:** ( هاواردەکا، خۆی دیار نیە) نەکەی، برادەر: نەڕۆی ! بوەستە تا تەقەکە نەختێ ئەهوەن دەبێتەوە !
**سەربازی یەکەم:** ( لە ناوەڕاستی شانۆدا بەدووای برادەرەکەیدا دەگەڕێ، بە هاوارەوە ) ئەهوەن نابێتەوە. ئەمە هێرشەکەیە. تۆ خۆت لە کوێ حەشارداوە ؟ هەڵسە برۆ، ئێرە جێ بێڵە ! ئێرە بۆمبابارا‌ن دەکرێ؛ دەکوژرێی. من دەڕۆم، برادەر گیان، خواحافیز... خوا..حا..فیـ..ز.. ( وردە وردە لەسەر شانۆ دووردەکەوێتەوە)
**سەربازی دووەم:** ( بە هاوار و سۆزێکی پڕ لە نرکەوە بانگی دەکا) راوەستە جارێ، برادەرە ئازیزەکەم ! وا گوللە و تۆپ هەموو لایەکی لێ تەنیوین. جارێ خۆت لە شوێنێکدا مات کە ! نەڕۆی ! دەکوژرێی ! دەکوژرێی، برادەرە ئازیزەکەم...

لەناکاو دەنگی ناڵە و هاوارێکی تاساو دەنگ دەداتەوە:



لەوانەیە دەنگی سەربازی یەکەم بێت و کوژابێت، بەڵام دەنگەکە زۆر لە دەنگی سەربازی دووەمیش دەچێت؛ لەوانەشە دەنگی هەر دووکیان بێت بەیەکەوە. خۆ لەوانەشە دەنگی هیچ کامێکیان نەبێ.

ـ پەردە ـ

هەولێر – بەرگەڵوو: ١٩٨١ـ ١٩٨٣

*** ئەم شانۆنامەیە، پێشتر بە ناونیشانی (ماڵئاوا ئەی وڵاتەکەم) بڵاوکراوەتەوە.**

## بەیانیت باش، ئەی غەریبی !

شانۆنامەی یەک پەردەیی



کەسەکان:

**نارین:** کچێکە لە تەمەنی ٢٥ساڵیدا، ئیفلیجە و لەناو جێ کەوتووە.

**فەرەیدوون:** کوڕێکە، لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا.

**پشتیوان:** هاوڕێی فەرەیدوونە.

ژوورێک. لە دەستەڕاستدا قەرەوێلەی نارین، کە زۆربەی بەشی پانتایی سەرشانۆی گرتووە. قەرەوێڵەیەکی تر لە سەرینی قەرەوێلەی یەکەمەوە درێژ بۆتەوە- لە بەشی دوواوەی سەرشانۆ، لەگەڵ قەرەوێلەی یەکەم ناوەڕاستی شانۆیان کردۆتە لاکێشەیەک. جووتێ دارشەق لە ژووررووی قەرەوێلەکەی نارین هەڵپەساردراون.
دەرگای رووەو حەوشە لە دەستە چەپدایە. لەپاڵ ئەو، دەرگایەکی تر ( دەرگای چوونە ژوورەوەی ئەودیو) رووبەڕوو دیارە. عەللاگەیەک بە دیوارەوە، لە نزیک قەرەوێلەکەی نارینە: پاڵتۆیەکی پێوە هەڵواسراوە. لەولاتر: دەلاقەیەک، لەپاڵیا: جلوبەرگی سەربازی، بە بزمارێکەوە کراوە. کورسیەک. مێزێکی چکۆڵە.
بە دیواری دەستەڕاستەوە، رەسمێک لەناو چوارچێوەیەکی گەورەدا، لە بارێکی خواردا، بە داوەبەنێک شۆڕ بۆتەوە و بزماری دەستەڕاستی خۆی بەرداوە. سەرشانۆ تاریکە.

**فەرەیدوون:** (رووەو دەلاقەکە. دەست لەناو دەلاقەکە دەگێڕێ)
چەندی چاوم دەگێڕمو دەگەڕێم، نایدۆزمەوە نارین!.. نیە. لێرە نیە! لەوانەیە لە شوێنێکی دیکەت دانابێ.
**نارین:** ( دەست لە ژێر بەتانیەکە دەردەهێنێ. بە نرکەنرکەوە، بە دەنگێکی کەوتووی نەخۆشانەوە) نا، هەر لەوێیە. ئێوارە، کە کراسەکەتم بۆ دووربیەوە، لەگەڵ دەرزیو بەکرەی داوەکە، لەوێم دانا، هەر لەوێیە.
**فەرەیدوون:** چەندی دەگەڕێم، نیە.
**نارین:** دە.. تۆ.. گلۆپەکە داگیرسێنە! لە دەلاقەکەی خوارەوەیە.
**فەرەیدوون:** دەلاقەی خوارەوە؟ ( لە نزیک خۆیەوە گلۆپەکە دادەگیرسێنێ، دەست بۆ قوتووی حەبەکان درێژ دەکا) ئەی بۆ لە هەوەڵەوە نەتگوت لە دەلاقەکەی خوارەوەیە!
**نارین:** با، وتم.
**فەرەیدوون:** (قوتووی حەبەکەی بۆ دەکاتەوە، دەیداتە دەستی. دەڕوا بەرەو ژوورەکەی ئەودیو. نارین، لەسەر قەرەوێلەکەی، بە جووڵەجووڵ، بە زەحمەتییەوە هەوڵ دەدا؛ دەیەوێ لە ناوک بەرەو خواری خۆی بۆ لای خۆی رابکێشێ و، پشت بە شیشەی قەرەوێلەکە بدات. نێوچەوانی، بە ڕەفتەیەکی زەیتوونیی تەنک بەستووە. قژی خاوی، بە شێواویو ژاکاوییەوە، بە دوو لاجانگی هاتوونەتە خوار. دوو دانە حەب لە شووشەکەوە دەخاتە ناو لەپی دەستی. فەرەیدوون دەست بە پەرداخێک ئاوەوە دەگەڕێتەوە لای، پەرداخە ئاوەکەی دەداتە دەست. بۆی دەچەمێتەوە، ئەژنۆی



لەسەر قەرەوێلەکەی ئەو دادەنێ: دەستی راستی دەخاتە ملییەوە، دەستی چەپیشی لەژێر پەرداخەکە رادەگرێ، تا نارین حەبەکەی پێ دەخواتەوە) ئێستا چۆنیت نارین گیان؟ چۆنیت!
**نارین:** ( بە ئازار و بێهێزییەوە) باشم فەرەیدوون گیان (دەست بە نێوچەوانی خۆیەوە دەگرێ، بە داهێزراوییەوە هەوڵ دەدا ڕابکشێتەوە، سەر دەنێتە سەر سەرینە هەڵپەساردراوەکەی قەد شیشەی قەرەوێڵەکە).
**فەرەیدوون:** ( دانوشتاوەتەوە، بە شێنەییەوە دایدەپۆشێ. دەگەڕێتەوە جێگەکەی خۆی. لەسەر عەرزەکە، لە پێینگانی قەرەوێڵەکەی خۆی، پشت بە قەرەوێڵەکە دەداتو قاچەکانی درێژ دەکا. جگەرە داگیرساوەکەی لەسەر تەپڵەکی جگەرەکەیەوە هەڵدەگرێتەوە و هێور هێور مژ لە جگەرەکەی دەدا. کتێبێک لە تەنشتی رووەوگێڕ کراوەتەوە).
**نارین:** سەعات چەندە فەرەیدوون؟
**فەرەیدوون:** ( ئاوڕ بۆ سەعاتی سەر مێزەکەی نێوانیان دەداتەوە) چوار و نیو! گلۆپەکە بکوژێنمەوە؟
**نارین:** تۆ.. وا بزانم.. دەخوێنیتەوە!
**فەرەیدوون:** (هەڵدەستێ گلۆپەکە دەکوژێنێتەوە).
**نارین:** ( رووەو فەرەیدوون) سفرەکە داگیرسێنە.
**فەرەیدوون:** ( گلۆپە سفرەکە دادەگیرسێنێ. دەگەڕێتەوە، پشت بە قەرەوێلەکە دەدات. سەری بەرزکردۆتەوە، تەماشای دوور، سەرەوە دەکا. ئاگای لە نارین بڕاوە، تاو تاو مژی قووڵ لە جگەرەکەی دەدا).
**نارین:** بیر لە چی دەکەیتەوە فەرەیدوون؛ لە قاسەی ئوتێلەکە هەمدیس؟!

**فەرەیدوون:** ( وەک ئەوەی خەیاڵی لای ئەو نەبێ، بێ جووڵە) قاسەی چی ؟

**نارین:** ئەوەی کە پێرێ پێت وتم.

**فەرەیدوون:** ( بە شەکەتیو خامۆشییەوە) وتم چی ؟

**نارین:** کە شەوێک بچیت لەو ئوتێلەی کە پێشتر تێیدا دەخەوتی؛ لەو کاتەی خاوەن ئوتێلەکە خەریکی نوێژکردن دەبێ، تۆ بە هەرچی چۆنێک بێ قاسەکەی بشکێنیتو پارەکەی هەرچەندێک تیابوو دەریبێنی ! ئەی وات نەوت! وات نەوت فەرەیدوون؟

**فەرەیدوون:** ( بە شپرزەییو نائارامییەوە) نا، نارین گیان. دڵنیابە، بیرم لەوە نەدەکردەوە.

(قەیرێ بێ دەنگی)

**نارین:** ( بە نەوایەکی ماتەمینبار) من دەمزانی، دەمزانی.

**فەرەیدوون:** چیت دەزانی؟

**نارین:** « هیچ ».

**فەرەیدوون:** چیت دەزانی؟

**نارین:** کاتێ دڵت دەدامەوە، دەتگوت: بەو پارەیەی کە دەستمان دەکەوێ، ئیجازەیەکی تەزویر و ناسنامەیەکی ساختەی ـ نازانم لەلای چ کەسێک ـ پێ دەکڕین و لەم دۆزەخە پێی دەرباز دەبین؛ دەڕۆین ( هەناسەیەکی قووڵی حەسرەتاوی هەڵدەکێشێ) من ئەوساتە زۆر نەخۆش بووم. دەمزانی کە تەنیا بۆ ئەوەتە دڵم خۆش بکەیت. هەرچەند دەشمزانی کە ئەگەر پێت بڵێم: « ئا، بچۆ » دەچووی، دەتکرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەش، من هەر رژد بووم، هەر رژد بووم و رێم نەدەدایتێ، رێم نەدەدایتێ ئەو ئیشە بکەیت.



( قەیرێ بێدەنگی)

**نارین:** ( لە مات بوونی فەرەیدوون ورد دەبێتەوە، وەک ئەوەی هێشتا هەر گومانی لە پەشیمان بوونەوەکەی فەرەیدوون مابێتو دڵنیا نەبووبێ).

**فەرەیدوون:** ( لە خەیاڵی خۆی رادەچڵەکێ، بێ ئەوەی تەماشای نارین بکات) نەء، بیرم لەوە نەدەکردەوە، نارین. دڵنیابە: بیرم لەوە نەدەکردەوە.

**نارین:** ئەی بەدرێژایی ئەو هەموو ماوەیە، پێش ئەوەی کە من داوای شووشەی حەبەکەت لێ بکەم؛ من ئاگام لێ بوو نەنوستبوویت، نەشتدەخوێندەوە، لە هەمان ئەم شوێنەی خۆت دانیشتبوویتو جگەرەت دەکێشا؛ بیرت دەکردەوە. بیرت لەچی دەکردەوە؟!

**فەرەیدوون:** ( هەڵدەستێتەوە).

**نارین:** تۆ ئاگات لە من نەبوو، من کاتێ لەم شوێنەی خۆمەوە لێت ورد دەبوومەوە: لە توێی دووکەڵی جگەرەکەی بەبات دەکرد، وە لە توێی بریسکەدانەوەی گلێنەکانتەوە، کە لاونیو لێمەوە دیاربوو، هەستم بە ئازادترین ساتەکانی هەناسەدانی عومرت دەکرد، هەستم دەکرد لە ئاسوودەترین راکشانو حەسانەوەدا دەژیت، وەک ئەوەی لە دڵنیاییەکی زۆر بەختەوەرانەدا بیت! تەنانەت منیش، هەر لە خۆمەوە دڵم خۆش داهات، وتم: لەوانەیە فەرەیدوون، مژدەیەک، هەواڵێکی خۆشی لە سنگدا بێ! توخوا، پێم بڵێ، ئەدی بە درێژایی ئەو هەموو ماوەیە، بیرت لە چی دەکردەوە؟!

(ساتێ بێدەنگی)

**فەرەیدوون:** بیرم لەو رۆژە جوانەی چەند مانگێک پێش ئێستە دەکردەوە، نارین! ئێوارەیەکی دەمەوبەهار بوو..

**نارین:** کام ئێوارە؟

**فـــەرەیدوون:** (بەدەم هاتوچۆکردنەوە) کە بە یەکەوە، لە باغەکەی نزیک « مەحەتتە» لەسەر ڕۆخی جۆگەلە ئاوێک، لەسەر عەردێکی بە گیاوگۆڵ دانیشتبووین، پشتمان دابووە درەختێکو گوێمان لە فیشکەی شەمەندەفەرە دوورەکان ڕاگرتبوو. من ئیجازەیەکی پێنج شەممەو جومعانم وەرگرتبوو. ئەو ئێوارەیە، لەشم ئازاری تەدریبی ئێوارانی معەسکەری پێوە نەبوو: خەیاڵ ئاسوودە و دڵخۆش، لەژێر درەختەکەدا، لە تەنشت تۆ پاڵم دابۆوە. دەوروبەرمان هەمووی سێبەری خۆشیبەخشی داروودرەخت بوو. لە هەر چوار لامانەوە، باڵندە، بە فڕکە فڕکی پڕ ئاهەنگی باڵیانەوە هەڵدەنیشتنو دەفڕینەوە. جریوە جریویان دەتگوت لە کانگای ئەوینی پاکی ئێمەوە هەڵدەقوولا. تۆ ئەو کاتە ئاوهات بەسەر نەهاتبوو نارین گیان: قاچت عەردی دەگرتو بە ئازادییەوە دەتتوانی بێیتو بچیت! لەژێر دەرەختەکەدا جار بە جار دەستت بەردەدامو دەچوویت لە چۆلەکە هەڵنیشتووەکانی دەوروبەرمان نزیک دەکەوتیتەوە، خۆت بۆیان دادەنووساند؛ دەتگوت: « فەرە گیان، هەر ئێستا چۆلەکەیەکی بچکۆلەت بۆ دەگرم!». بە بیرت دێ: ئەو ئێوارەیەی کە تاڵە گیایەکم لە پەنجەت بەست و بۆتم کرد بە ئەڵقە؟

**نـاریـن:** ( لەناو جێ، ماتەمگرتوو، نوقمی خەیاڵێکی بریندار).

**فـەرەیدوون:** ئەو ئێوارەیەی کە تاڵە گیایەکەم لە پەنجەت ئاڵاند و بۆتم کرد بە ئەڵقە. بە بیرت نایە، نارین؟

**نـــاریـــن:** ( بە کـوژاوەیی، بە دەنگێکی زەلیلانەوە) پەشیمانی، فەرەیدوون؟



**فـــەرەیدوون:** نەء ، پەشیمان نیم. پەشیمان نیم. تۆ چۆن دڵت دێ ئەم قسەیە دەکەی ؟ تۆ ئێستاش خۆ دەمبینی: لە ساتەکانی لەگەڵ تۆدام، بە دڵێکی چەنێک گەرمتر بۆ ژیان، بە دەنگێکی چەنێک روونتر دەدوێم. شتەکان چەند جوانتر، چەند رووناکتر، چەند خۆشەویستتر دەبینم! ئینسان چۆن لەو دەستە پەشیمان دەبێتەوە کە ئەوی لەناو تاریکترین قۆزاغەی گۆشەگیرییەوە رزگارکردبێت؛ سامناکترین ڕێگای بێهوودەی ژیانی پێ گۆڕیبێتو ڕێگایەکی تازەی دڵنیاییو هێزی پێ پیشان دابێ! ؟ چۆن، نارین گیان؟ بەڵام، بیر دەکەمەوە ( کەمێک وەستان) نارین گیان، هێشتا یەکترمان نەناسیبوو؛ کاتێ حەوت سەربازە فیرارەکەیان لە بەردەم من و سەدان سەربازی دیکە، لە مەیدانێکی ناوەڕاستی ئۆردووگاکەمان گوللەباران کرد، من دووای ئەوەی لەتاو بینینی ئەم دیمەنە گیانهەژێنە لە خۆچووم و پاشان کە چاوم کردەوە دیتم « لە زندانێکدا بەند کراوم»؛ ئەو ڕۆژە ـ دووای ئەو ڕووداوە ـ دەمەوێ ئەوەت پێ بڵێم: یەکەم جارم بوو لە ژیانمدا هەست بەوە بکەم رووبەڕووی ژیان کراومەتەوە. رووبەڕووی دنیایەک غەیری ئەو دنیایەی جارانی گۆشەگیریم. ئاخر.. سەیر بوو.. من پێشتر.. وەک ئەوەی هەرگیز هەستم بەوە نەکردبێ کە لەم وڵاتەدا گوللەباران کردنی خەڵکی بێ گوناه هەیە! یا ئینسانی بەزۆر جل لەبەرکراوی سەربازی و ناردراو بۆ جەنگ، وەیا ئەو زندانانەی کە من خۆم بینیمن و چێشتی سارد و بێزەوەری سێ جەمەم لەگەڵ خواردن. فرمێسکی گەرمو درشتو روونیان دەڕژایە سەر دەستو پەنجەو بازووەکانم. ئەو بێ تاوانانەی، من دڵنیام، تۆش بتدینایە: ڕێزت لە ئازار و

چیرۆکە تاڵەکانی ژیانیان دەنا، حەزت دەکرد یارمەتییان
بدەیت. سایەقی لۆری، کرێکار، قوتابی، فیتەرچی.. گوڕی
هێز و ژیان لە دڵیاندا، لە چاویاندا شەپۆلی دەدا.
دەیانویست بژین، ساتەکانی ژیان تاقیبکەنەوە. دەزانی؛
لەوە دەچێ من، جاران، هەرگیز بیرم لە ئازاری مرۆڤ
نەکردبێتەوە. من ئەو چەند ڕۆژەی بۆ تەحقیقو لێپرسینەوە
لە زندان بووم، کە هاتمە دەرەوە، بێزم لەو قۆزاغە پیسە
دەکردەوە کە بەدرێژایی عومرم لەناوی دەژیام. وەک ئەوەی
لەناو چاڵێکی تاریک و بۆگەنی سەرداپۆشراودا بووبم:
عەودالی باریکترین داوە تیشکی کلاورۆژنەیەک بووم.
دەمویست لەو قۆزاغەی گۆشەگیرییەی چەندین ساڵەی
رابردووم بە یەکجاری بێمە دەوەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا
هەستم بە بێهێزی و نەتوانین دەکرد. من ئەو ماوەیە بۆ
یەکەمین جار بوو لە ژیانمدا هەستم بە لاوازیی خۆم کرد، بۆ
یەکەمین جار بوو هەستم کرد حەوجەی دەستێکم! نارین، من
لەگەڵ تۆدا توانیم بێمە دەرەوە و چەند هەناسەیەکی پاک، پڕ
بە سییەکانم هەڵبکێشم و دووبارە گوڕی خوێنو ژیان لە
بەدەن و ڕۆحمدا بکەوێتەوە گەڕ.
**نارین:** ئاه فەرەیدوون، خۆزگە هەر ئەوسا، دووای
گیرانەکەت و یەکسەر پاش یەکتر ناسینمان رامان بکردایە!
بۆچی هەر ئەوسا بەیەکەوە رامان نەکرد و ئەم شارەمان
بەجێ نەهێشت؟ تۆ قەت بیرت لە راکردن دەکردەوە؟
**فەرەیدوون:** ئا، نارین، کە تۆم ناسی. بەڵام ئێمە
ئەوساتە، تازە سەرەتای یەکترناسینمان بوو!
**نارین:** راست دەکەی، جارێ بە هەمووی سێ چوار
پیاسەمان پێکەوە نەکردبوو.



**فەرەیدوون:** دووای ڕەتبوونی ئەو ماوەیەش، کە بیرم لێ
دەکردەوە: تۆ و باوکت، بە نەفیکراوی فرێ درابوونە ئەم
تاراوگەیە. وەک دەیان خێزانە کوردی نەفیکراوی دیکەی
ئەم جنووبە نەفرەت لێکراوە، ناوتان، وێنەتان،
ناونیشانتان، لە هەموو سەیتەرە و نوقتەی تەفتیشەکانی
دەوری ئەم شارەدا هەبوو. هەرچی سەیتەرەکانی دەرەوی ئەم
شارە هەیە، تا دەگەیتە سەیتەرەکانی (دیوانیە)و
(ڕومادی)و بەغداش، هەر هەموویان، هەر یەکەو فایلو
لاپەڕەیەکی درێژیان لەلایە: ناو و ناونیشانی هەموو تاکە
کەسو خێزانە کوردە نەفیکراوەکانیان تێدا تۆمار کراوە. خۆ
ئەم عارەبانەش کورد هەر بە پێست و ڕەنگی قژ و دەم و
چاوییەوە دەناسنەوە! (کەمێک وەستان، بە حەسرەتەوە)
راکردنمان بەیەکەوە ئەستەم بوو: نەخشەو پلانێکی وردی
دەویست (هەناسەیەکی حەسرەتاوی هەڵدەکێشێ) دەنا من
دامنابوو کە باسی ئەم مەسەلەیەت لەگەڵ بکەم و بەیەکەوە
بیر لە رزگاربوونی خۆمان بکەینەوە. من دامنابوو.. تا ئەو
کاتەی- کە هەموویشی مانگێکی بەسەردا ڕانەبورد: ئەم
کارەساتەی باوکتی بەسەر داهات!
( قەیرێ بێدەنگی، نارین سەری دادەنوێنێتە سەر سنگی)
**فەرەیدوون:** دەزانی بیرم لە چیی تریش دەکردەوە؟
**نارین:** لە چی؟
**فەرەیدوون:** لە زیندان! (وەک ئەوەی ژانەسەرێکی لە
ناکاو گرتبێتی، هەردوو دەستی لەناو قژی خۆی دەئاڵێنێ.
چەند ساتێکی کەم هیچ قسە ناکا) ئاه نارین گیان (وەک
ئەوەی بەدەم خەونەوە قسە بکات) شەشەمین ڕۆژم بوو لەناو
زندان.. ئەمجارە بردمیان فڕێیان دامە ناو ژوورێکی

بچووکەوە- دوو مەتر درێژی و مەترێک پانایی بوو. وێڕا وێڕای بن دیوارەکانی، بۆنی ڕشانەوە و میزی لێ دەهات. لە ناو ژوورەکە، ساتەکانی پێشووم دەهاتنەوە پێش چاو. نارین، کاتێ ئامر سریەکەمان، لە ریزی پێشەوە، لە نزیک حەوت کۆڵەگە دارەکە، ڕووبەڕووی مەیدانەکە « وەک مێگەلە مەڕێک» داینیشاندین: من لە ریزی دووەمی پێشەوە، لە ناو کۆمەڵێک سەربازی دیکە دانیشتبووم. لە ناکاو، دەنگی سامناکی ئاژێرێک ڕایچڵەکاندین، تەماشامان کرد: جێبێکی درێژی سپیی سەرگیراو « لە ئیسعافی نەخۆشخانان دەچوو» لەولای مەیدانەکەوە رایگرت. سەرتاسەری ئەو ئۆردووگا گەورەیە، بە عەقید و رائید و زابط و ئامرسریە و عەریفەوە، بەو هەموو هەزاران سەربازەی ناو ئوردووگاکەشەوە- ئەوانەی بە دانیشتنەوە بوون، ئەوانەی بە پێوە بوون- ئەڵقەیەکیان دروست کردبوو؛ چاوەڕوانی بینینی دیمەنەکەیان دەکرد. جێبە درێژە سپیەکە رایگرت، چەند زەلامێک، بەپەلە رایانکرد. حەوت سەربازە چاوبەستراو و قۆڵبەستراوەکەیان لە جێبەکەوە هێنا خوارەوە، قۆڵیان گرتن و هێور هێور ڕووەو مەیدانەکە دەیانبردن: یەکدووانێک لە پێشەوەیان دەڕۆیشتن و چەندێکی دیکەش لە دوواوەیان، بێدەنگ، زۆر بە سستی و سامناکیەوە هێڵی ناوەڕاستی بازنەی خەڵکەکەیان دەبڕی، تا گەیاندنیانە لای ریزە کۆڵەگە دارەکانەوە « هەندێ زیخیان لەپێش کۆڵەگە دارەکان رۆکردبوو» ئنجا بە گوریسێکی ئەستوور، لە دارەکانیان بەستانەوە، خۆشیان پشتاوپشت کشانەوە ( بە هەرەسو ئازارەوە) ئاخ، من بەدرێژایی هەموو ئەو ساتانە، لەگەڵ رابووردنی هەر چرکەیەک، تا ئەو ساتەی کە دەنگی



سامناکو تۆقێنەری یەکەم دەسرێژ باڵندەی سەر درەختەکانی پشت مەیدانەکەی بەرەو قوڵایی ئاسمان هەڵفڕاند؛ دەزانی هەستم بە چی دەکرد نارین؟ تەنیا یەک شت لە مێشکمدا دەخولایەوە: « هەر ئێستا نا، دەمێکی دی؛ دەبێ بە جواب بێم، دەبێ بە جواب بێم!» (خاو دەبێتەوە) بەڵام، نەمتوانی! ئەم هەستی نەتوانینە، ئەم هەستی زەبوونی و حەژمەتە، تەنانەت لە ژووری زندانەکەشم، هێشتا هەر ئازاری دەدام. (ساتێ وەستان. پیش دەخواتەوە. بە لەخۆتووڕەییەوە) زۆر سەیر بوو. جاران ئینسانێک، یا هاوڕێیەکەم کاتێ حەژمەت و کەسەر و بێزاریی خۆی، لەتاو ئەو جۆرە دیمەنە ناشیرینانەی ژیان دەردەبڕی، یان کە باسی هەر جۆرە قەهر و تلانەوەیەکی دیکەی خۆی، بەدەست ژیانەوە بۆم بکردبایە، من پێی قەڵس دەبووم، هەمیشە وام دەبینی کە دەربڕینی ئەم جۆرە قسەوباسانە، لە ڕشانەوەیەکی بۆگەن زیاتر هیچی تر نییە. لەو کاتانەدا، هەمیشە، بە فیگاریەکی پڕ لە بێزەوە لە دڵی خۆمدا دەمگوت: «چیە ئەمە؟»، «وەک ئەوە وایە کە لەشی خوێناوی و پڕ کێمی خۆی ڕووت بکاتەوە و لەبەردەمت رایبخات؛ بۆ ئەوەی تۆش بەزەییت پێیدا بێتەوە!»، دەمگوت: «هەر کەسە و لە برینی کێماویی خۆی بەرپرسیارە». زۆر جاران، لە تووڕەییان، بەو هاوڕێیانەی خۆمم دەگوت: « کە بە بێزاری و تلانەوەی خۆت هەڵ ناکەیت؛ بۆچی خۆت ناکوژیت؟ » بەڕاستیشم بوو، دەزانی؟ ( کەمێک وەستان. بە شەکەتیەوە) ئاه، نارین گیان، هەست دەکەم جاڕسم کردیت ( بە زەبوونیەوە) قسەکانم پچڕ پچڕن؛ ورێنە ناکەم: دەمەوێ پارچە شکاو و پرژوبڵاوەکانی بوون و ژیانم بە یەکترەوە گرێ بدەم. دەمەوێ

ئەوەت پێ بڵێم: من ئەگەر تۆم نەناسیایە، تووشی چارەنووسێکی زۆر رووڕەشانە دەهاتم، تووشی مردن؛ مردنێکی بێمانا، مردنێکی لە گیانی خۆ بێزارانەی ناو سەنگەرێکی ئەم جەنگە نەفرەتاوییە. یانیش ئەوەتا تووشی خۆکوشتنێکی لە ناکاو! نارین گیان، تۆ هەم ڕێگام بووی، هەم چارەنووسیش ( لەسەر کورسیەکە، وەک سەرمای بێ، خۆی وێک دێنێتەوە. بە نەوایەکی بریندارەوە) کەچی تۆش، نارین، بە هەموو دڵتەوە، پێم دەڵێی: (پەشیمانی). من چۆن پەشیمانم، چۆن پەشیمانم!

**نارین:** داوای لێبوردنت لێدەکەم، فەرەیدوون، من هەست دەکەم: بەو قسەیەی کردم ئازارم دایت.

**فەرەیدوون:** ( لەناکاو لەسەر کورسیەکە هەڵدەستێتەوە) ئینسان حەزدەکا سوودی هەبێ، دەزانی نارین؟

**نارین:** ( بە ماتیەوە، لە هاتوچۆکردنی فەرەیدوون بەدەم قسەکردنەوە، ورد دەبێتەوە).

**فەرەیدوون:** رۆژێکیان- یەکدوو مانگ پێش ئەوەی کە تۆ بناسم- تازە بۆ سەربازی هاتبوومە ئەم شارە، ئێوارە بوو: لە ئۆردووگاوە بەرەو ئوتێلەکەم دەگەڕامەوە، لەسەر شۆستەیەک راوەستابووم و دەمویست لە شەقام بپەڕمەوە، لەو کاتەدا، شاقامەکە، بەردەوام ئوتومبیل‌و زیلی سەربازیی پێدا دەڕۆیی‌و بواری پەڕینەوە نەبوو. کە ئاوڕێکم بۆ دەستەڕاستی خۆم دایەوە، دیتم: کوێرێک، کوور، دەست بە گۆچانەوە، لەولای منەوە راوەستابوو؛ ئەویش هەر دەیویست بپەڕێتەوە. چووم دەستیم گرت و لەگەڵ خۆم لە شەقامەکەم پەڕاندەوە! دەزانی نارین، ئەو ئێوارەیە، ئەو ڕووداوە ئاسوودەییەکی یەکجار گەورەی لە گیانمدا خرۆشاند! باوەڕ



بکە: هەر لەو ساتەوەی کە دەستم گرت، تا ئەو ساتەی کە شەو خەوم لێکەوت، بە درێژایی سات، لە خۆشترین‌و دلاوەرترین ساتەکانی ئاسوودەییدا دەژیام. هەستم دەکرد ئەو ئێوارەیە بوونێکم هەبووە، مانایەکم هەبووە؛ سوودێکم هەبووە. ئینسان هەمیشە دەیەوێ شتێکی هەبێت و بیداتە دنیا، بیداتە ئەوەی غەیری خودی خۆی. من ئەمڕۆ، زیاتر لە هەموو ساتێک، زیاتر لە هەموو ئینسانێکی دیکە حەز دەکەم هێز و تواناکانی خۆم ببەخشم (وەک ئەوەی بیەوێ شتێکی بداتێ) من خۆشم دەوێی، خۆشم دەوێی (بە زەردەخەنەیەکی ئومێدەوارنەوە) دەزانی نارین، من زۆر جاران وا هەست دەکەم ئەوین و پەیوەندیی ئێمە: شیعرێکە، شیعرێکی ناتەواوی بەردەستمە کە دەبێ هەموو هێزی گیانی خۆمی پێ ببەخشم؛ شیعرێکی ناتەواوی بەر دەستم کە خەریکم تەواوی دەکەم. تۆ دڵت دێ دەست لە شیعرێکی ناتەواوم هەڵبگرم و بە نیوەچلی وازی لێ بێنم؟

**نارین:** ( بە دەنگێکی پڕ لە ئازارەوە) چۆن دڵم دێ؟ ( بە خۆشەویستیەکی پڕ لە غەمگینی‌یەوە) ئێ فەرەیدوون، دە وەکو دوێنێ و پێرێش پێم وتی: ئێستەش خۆ نەچووە بچێ؛ خۆ بە هەمووی تەنیا سێزدە رۆژ بەسەر ماوەی غایب بوونتدا ڕەت بووە!

**فەرەیدوون:** ( بە خەمساردییەوە) ئێ؟

**نارین:** ئەگەر تۆ ئەمڕۆ بچیتەوە پێش و خۆت تەسلیم بکەیتەوە؛ قابیلە بۆ تەنیا سێزدە رۆژی غایب بوونت حسێبی فیراریت بۆ بکەن؛ قابیلە؟

**فەرەیدوون:** (پیش دەخواتەوە) نارین گیان، تەنیا یەک رۆژ، یەک رۆژیش چیە غایب ببیت، لەلای ئەوان بە فیرار

لەقەڵەم دەدرێی.

**نارین:** هەر لەبەر سێزدە رۆژ – « سێزدە رۆژ» ؟

**فەرەیدوون:** ئەمە یاسای سەربازییە! بۆ ماوەی حەوتساڵی رەبەق دەچێ، هەر لە یەکەم رۆژی ئەم جەنگەوە، رێورەسمو یاسا لێرە ئاوهایە. ئەمە جەنگە. جەنگ.

**نارین:** ( حرسو حەژمەت قورگی دەگرێ، دەداتە پرمەی گریان ) ئەی چار فەرەیدوون؟! من هەست دەکەم ئێمە لە بیابانێکی تاریکداین. لەم غەریبییەدا، لەم شارە بێگانە و تاراوگەیەدا، بێ کەسوکار، دوور لە خزم و ئاشنایانمان؛ کەسێ ناناسین رووی لێ بنێین، کەسێ ناناسین داوێنی بگرین یارمەتیمان دات. کەس نییە بە فریای هاوارمان کەوێ. ئێمە، ئەوا سێ رۆژی رەبەقە، بیر لە چارەسەرێکی ژیانی خۆمان، بیر لە رزگاربوونمان دەکەینەوە؛ ناتوانین. ناتوانین. هەر هەموو دەرگایەکمان لە روو داخراوە، داخراوە! ئێمە لە دۆزەخداین. دۆزەخ.

(قەیرێ بێدەنگی)

**فەرەیدوون:** ( بەئارامیەوە) ئەوا وەریشیان گرتمەوە! ئەی پاشان؟

**نارین:** ( دەگری).

**فەرەیدوون:** من گەر لەم لەم مردنەی ئێستاش قوتارم ببێ، بۆ مردنێکی دیکە دادەنرێمەوە: دیسانەوە بۆ سەنگەری شەڕ! من لەو کاتەدا، چۆن دەتوانم تۆ بەم حاڵەوە بەجێ بێڵم و بچمە ناو سەنگەری شەڕ؛ خەڵکی بێ گوناه بدەمە بەر شەست تیر و گوللە، چۆن؟ چۆن دەتوانم تۆ ئاوها بەم حاڵەوە جێ بهێڵم و خۆشم بسپێرمە دەست ئەم چارەنووسە پڕ تاوانکاریەوە؟ من شەڕ لەپێناو چی بکەم؟



لەپێناو چی سەنگەر بگرم!؟ لەپێناو پاراستنی شوورەی رژێمێک، دوڵەتێک- کە هەر ئەو بوو باوکتی بەم چارەنووسە رەشە برد و دووایەش تۆی تووشی ئەم مەرگەساتە ئازاراوییەی ئەمرۆ کرد؟ لەپێناو ئەوە بچم سەنگەر بگرم کە لێگەڕێم: تۆ « لە ژوورەوە» ، ئەم نەخۆشی و دەردە سامناکەت رۆژ بە رۆژ پتر هێز و خوێنت بمژێ و ژیانت لێرە بێ کەسوکار، لێ ببێتە چوار دیواری سڕوسارد؛ پاشانیش رۆژێک، لەناو مەرگەساتی دەردی خۆت و حەژمەتی مندا سەر بنێیتەوە؟ لەپێناو ئەوە! لەپێناو ئەوە بچم سەنگەر بگرم و لە سەربازی وەرگیرێمەوە؟

**نارین:** ( لەناکاو لە گریانەکە دەوەستێ، بە دەنگێکی ئاستەم، بەڵام رژدو بەتاو، وەک ئەوەی پیلانێک دابنێتەوە) فەرەیدوون، ئەگەر تۆ لە سەربازی وەربگرنەوە، ئەوا «سەنگەر و شەڕ» گیروگرفت نەبوو. ئەو سات، هەر لە ئیجازەی یەکەمتەوە، بەیەکەوە رامان دەکرد؛ لێرە نەدەماین.

**فەرەیدوون:** ( بەنائومێدیەوە) نارین گیان! وەرگیرانەوەم لەسەربازی، دووای غایب بوونی ئەم سێزدە رۆژەم، شتێکە ئەگەر واسطەی لەلای عەقیدیش بۆ بکەیت: موستەحیلە! موستەحیلە وەرم بگرنەوە و وەک حەوت سەربازە فیرارەکەی بە چاوی خۆم دیمن گوللەبارانم نەکەن!

**نارین:** ( دەلاڵێتەوە) توخوا وا مەڵێ، وا مەڵێ فەرەیدوون!

**فەرەیدوون:** ( مشت لەناو لەپی دەستی خۆی دەدا) ئەوەیە ئیتر.

**نارین:** ( وەک ئەوەی لە خەونێکی سامناکدا هەڵسابێتەوە، بیر دەکاتەوە، چاو بە دەوری خۆیدا دەگێڕێ.

بە سەرسوڕماوییەکی پڕ لە ئازارەوە) فەرەیدوون، من باوەڕ ناکەم ژیانمان بەم ڕۆژە گەیشتووە! من هەموو شتەکانم «وەک خەونێک» زۆر بە ئاڵۆزی دێنەوە پێش چاو! هیچ شتێکم بە تەواوەتی نایەتەوە بیر! لە کەیەکەوە هەر لێرەین؟ بۆ!؟ چۆن بەم ڕۆژە ڕەشە گەیشتین؟! لە چیەوە دەستی پێکرد؟!

( کەمێک بێ دەنگی)

**فەرەیدوون:** لەوەوە دەستی پێکرد کە باوکت، « مام مستەفا» بەڕەحمەت بێ، خۆی کوشت و گیانی سپارد! ئیتر دووای ئەوە، کاتێ تۆ دەمەو ئێوارەیەک گەڕابوویتەوە ماڵ، کە بە تەنیا ، دیمەنی لەشی هەڵواسراوی ئەوت دیبوو؛ بووڕابوویتەوە. شەو و ڕۆژێک بە بێ هۆشی، لەژێر مەیتی هەڵواسراوی ئەودا، لە ناوەڕاستی ئەم ژوورەدا، لە شوێن ئەم کورسییە کەوتبوویت و من نەمدەزانی! کاتێ گەیشتمە سەرت، تۆ لێرەدا، کەڵەواژ ببوویتەوە؛ دەمو چاوت ڕەنگی مردووانی لێ نیشتبوو! نارین گیان.. لەو ڕۆژەوە بوو ئیتر تووشی ئەم ئیفلیج بوون و لەپێ کەوتنەت هاتی. ( کە تەماشای نارین دەکا، ئاوازی قسەکردنی دەگۆڕێ) چۆن نارین گیان، چۆن بەبیرت نایە؟ لێرە، لەسەر هەمان ئەم قەرەوێڵەیەی خۆت، لەناو جێ کەوتبوویت. جار جار، لە ناکاو، کە ئەم دەردە فێیە دایدەگرتیت و بە هێنکە هێنکی دەخستیت، خەریک دەبووی بخنکێی؛ منیش دەهاتم، لەسەر هەمان ئەم قەرەوێلەیەی خۆت، هەر دوو تۆقی لانێوچەوانتم، بە دوو پەنجەی دەستی ڕاستم توند توند دەگوشی، تا ئەو ساتەی کە وردە وردە بەری دەدایت و دەمارەکانت خاو دەبوونەوە؛ ئینجا منیش دڵۆپە فرمێسکی گەرم و روونم، تنۆک تنۆک دەکەوتنە سەر رووومەتەکانت، بە



هێواشی، لەسەرخۆ، هەر دوو لاپشتی شانەکانتم دەگرت و درێژم دەکردی؛ دامدەپۆشیت. بە بیرت نایە؟ بەبیرت نایەتەوە ! من بەدرێژایی هەر هەموو ئەم دوو هەفتەیەی کە ئەم دەردە فێیەت دەگرت، لەژێر سەرت بووم، لە پەناتەوە بووم. (هەناسەیەک هەڵدەکێشێ) نارین گیان! لە پێ‌کەوتن و ئیفلیجیەکەت ئەوەندە نسکۆدار و بێ ئۆقرەی نەدەکردم. من لە ڕۆژەکانی سەرەتادا هەموو رۆژێک، دووای ئەوەی لە تەدریبی ئێوارانو تەنانەت دووای تەدریبی نیوەڕۆیانیشم کە تەواو دەبووم، یەکسەر دەهاتمە لات و ناو جێگاکەتم پاک دەکردەوە، چێشتم بۆ لێدەنایت و دەرخواردم دەدایت. هیچی مایەی دڵازاری و پەرێشانیم نەبوون، بەڵام ئەم دەردە فێیەت، ئەم ژانی ئەعصابەت بوو کە دنیامی لێ هێنابۆوە یەک. ئاخر تۆ، نارین، گەلێک جاران دەستت توند لە قوڕقوڕاگەی خۆت گیر دەکرد و لەتاو ئازارت، لەتاو ئەشکەنجەی گیانت، خەریک دەبووی لە حەژمەتان خۆت بخنکێنی! رۆژ بە رۆژیش ئەم دەردە، سامناکتر رووی تێدەکردی. لە هەفتەی یەکەمی لەناوجێ کەوتنت، ئێوارەیەک، پێشنیاری ئەوەم لە دکتۆرەکەت کرد، کە بتبەن لە نەخۆشخانە بتخەوێنن، گوتم: لەوێ، بەڵکو هەم سستەرێک بەردەوام ئاگادارت دەبێت، هەم لەوانەیە لەوێ زووتریش چاک ببیتەوە. گاڵتەی بە قسەکەم هات، وتی: «ئەوا شەش مانگ زیاترە هەرچی نەخۆشی پێشووش هەبووە، لە هەردوو نەخۆشخانەکەی ئەم شارە، تەنانەت نەخۆشی خەتەرناکیش، هەموویان لە نەخۆشخانەوە راپێچاوەتەوە ماڵی خۆیان، بۆ ئەوەی جێگا بۆ ئەو هەموو سەربازە بریندار و بێ دەستو لاقانە چۆڵ بکرێت کە لە

سەنگەری شەڕەوە دەهێندرێنەوە». ( پیش دەخواتەوە) هەرچۆنێ بوو بە هەزار حاڵ توانیم ئیجازەیەکی سێ رۆژی وەربگرم و بتوانم لە تەنیشتت بمێنمەوە. ( کەمێک وەستان) نارین گیان، ئیجازە سێ رۆژییەکەی من کۆتایی هات، کەچی ئەم دەردە فێیە سامناکەی تۆ، رۆژ بە رۆژ پتر لێتی پیس دەکرد و کوشندەتر ئازاری مێشک و گیانتی دەدا. جاری وا هەبوو منیش لەگەڵ تۆ، بە گریان و لالانەوەی تۆ، دەکەوتمە گریانەوە. نارین، من ئیتر، لەوە بەدووا، تەنانەت بۆ سەعاتێکی چوونە بازاڕ و خواردنو داوودەرمان کڕینیش چییە، نەمدەتوانی، دەترسام لەوەی بەتەنیات جێ بهێڵم. ئەوا بۆ ماوەی حەڤدە رۆژی رەبەق دەچێ تۆ لەناو جێ کەوتوویت و منیش لەژوور سەرتام. سەعاتێک چییە لێت دوور نەکەوتوومەتەوە. ئەم یەک دوو رۆژی ئەم دووایییەت نەبێ، شوکر: ئارامیت و بەم حەبە تازانە فەرقێکت کردووە.

(ساتێ بێ دەنگی)

**نارین:** من هیچم لەبیر نیە! هیچم نایەتەوە بیر، رووداوەکانی ئەم سێ رۆژەی ئەم دووایییە نەبێ!

(ساتێ بێ دەنگی)

**فەرەیدوون:** چایەکت بۆ لێ نێم، نارین؟

**نارین:** نا توخوا، دانیشە، قسەم بۆ بکە.

**فەرەیدوون:** ( جگەرەیەک دادەگیرسێنێ) رۆژێکیان بە پشتیوان-م وت:...

**نارین:** پشتیوان کێیە؟

**فەرەیدوون:** کوڕێکی کوردە، ئەویش سەربازە، هاو ئۆردووگامە. تاقە زەلامێکە کە لێرە هاوڕێیەتیم لەگەڵی



هەیە. ئەو وەختە کە لە ئوتێلیش دەخەوتم، تەنیا ئەو جارجار دەهاتە لام و سەری لێ دەدام، لە نەخۆش کەوتنی تۆش، ئەلهەق، زۆر یارمەتیی دام. من هەمیشە لە ژوورەوە، لە پەنای تۆوە بووم، ئەوم دەنارد. دوو سێ جاران ئەو دکتۆری بانگ کردە ئێرە؛ داوودەرمانیش، هەر ئەو دەچوو بۆمانی دەکڕی. بەڵام رۆژێکیان، کە جارێ تۆ هێشتا تەواو نەهاتبوویتەوە سەرخۆت و ئەم دەردە فێیە بەری نەدابوویت، دڵیشم نەدەهات پێت بڵێم کە خۆم پارەم لەلا نەماوە و داوای پارەت لێ بکەم.. رۆژمان نەمابوو نارین! ( لەناکاو رووداوەکاتە ئەو)- ئەهـ !

**نارین:** چی؟

**فەرەیدوون:** دوێنێ لەبیرم کرد!

**نارین:** چی؟

**فەرەیدوون:** جلوبەرگەکانی کە پێرێ لەبەرم داکەندیت.

**نارین:** ئێ؟

**فەرەیدوون:** بیانشۆم.

**نارین:** (بە زەردەخەنەیەکی شەرمناکەوە) توخوا خۆم دەیانشۆم، تۆ سبەینێ بە رۆژ، هەر بمگەیەنە سەر تەشتەکە. ئەمڕۆ باشترم. دەی توخوا، قسەکەت تەواوکە!

**فەرەیدوون:** رۆژمان نەمابوو. بۆ قوتووە رۆنێک، وتم با بەیەکجاری پارەیەکی زۆر قەرز بکەم. ڕووم لە پشتیوان نا، پێم وت: پشتیوان، ئەگەر هەتە « دە دینارم » بە قەرز بدەرێ! سوور دەشمزانی هەیبوو، کەچی نەیدا. چونکە هەڵبەتا وای بیر دەکردەوە، کە ئێمە لەم شارەدا، کەساس و بێ پارەو پوولین، ناتوانین وەها زوو ئەم قەرزەی ئەو بدەینەوە! نەیدا، نارین! لەو ڕۆژەوەش، ئەوە بۆ هەفتەیەک

دەڕوا، نەمدیوەتەوە.

(قەیرێ بێدەنگی)

**نارین:** چەند پارەمان ماوە، فەرەیدوون؟

**فەرەیدوون:** وابزانم.. ( بەرەو دەلاقەکە دەڕوا. جەنتا بچووکە دەستیەکەی نارین بە دەستەوە دەگرێ و دەیکاتەوە، پارەکان دەژمێرێ) تەنیا بیست دینار و.. شتێک!

(قەیرێ بێدەنگی)

**نارین:** بۆ ئەم سەرە مانگەی داهاتوو، گەر نەچم دەوامی خۆم بکەم، ئەوا بۆ ئەم زستانەی داهاتوو دەبێ سوالّ بکەین، دەزانی فەرەیدوون؟

**فەرەیدوون:** ( جەنتا بچووکە دەستیبیەکە دادەخاتەوە، هەڵی دەداتەوە ناو دەلاقەکە)

**نارین:** بەڕاست فەرەیدوون، ئەوا من کاتی خۆی، لە رووم نەدەهات ئەم پرسیارەت لێ بکەم. من قەت نەمدیوە لە هیچ ئیجازەیەکت بگەڕێیتەوە و سەر لە کەسوکاری خۆت بدەی! تۆ هیچ گەڕاویتەوە ؟

**فەرەیدوون:** نەء.

**نارین:** بۆچی فەرەیدوون؟

**فەرەیدوون:** ( دڵشادییەکی لە ناکاو روخساری دەگەشێنێتەوە. بە زەردەخەنەوە) ئەڵڵاهـ نارین! خەونێکم بیرهاتەوە! دوێنێ شەو خەونم بە دایکمەوە دی. لە خەونمدا گەڕابوومەوە. جەنتایەکی گەورەم بە دەستەوە بوو، لەناو حەوشەی ماڵی خۆمان دایکم بە پیرمەوە هاتو باوەشی پیا کردم. بە زەردەخەنەیەکی گازاندەوە پێی گوتم: « ها ؟ چۆنە گەڕاویتەتەوە!»، وتم: « هاتووم خەبەرێکی خۆشت بدەمێ». باسی تۆم بۆی کرد. زۆر کەیفی هات. وتی: چ



کارەیە؟ وتم: مامۆستایە. وتی: لە کوێ؟ وتم: لە گوندێکی نزیک ئەو شارەی کە من تێیدا سەربازم. وتی: عارەبە؟ وتم : نەء، کوردە! وتی: ئەی کەسوکاری لەکوێن؟ وتم: هیچ کەسی نییە؛ سێ خوشکی هەن، ئەویش هەر یەکەو وان لە وڵاتێکدا. وتی: لەکوێن؟ وتم: یەکیان لە ئێرانە، ئەوی تریان لە تورکیا، ئەوەی تریشیان لە سووریایە. عاجباتیی ما، نارین. ئەڵڵاهـ، چ خەونێکی خۆش و لەززەتبەخش بوو! لەو ساتەدا هەستم دەکرد چی ئاواتی ژیانم هەن بەدی هاتوون.

**نارین:** خۆزگە رۆژێک ئەم خەونەت بە ڕاست گەڕایە. هەردووکمانی پێکەوە بدیایە!

**فەرەیدوون:** خۆزگە نارین! لەوەتەی تۆم ناسیوە، هەمیشە حەزم کردووە کە رۆژێ لە رۆژان، بەیەکەوە بگەڕێینەوە.

**نارین:** ئەی بۆچی لەمەوپێش نەدەگەڕایتەوە؟

**فەرەیدوون:** نەمدەویست. حەزم نەدەکرد.

**نارین:** بۆ؟ باشە، فەرەیدوون، ئەوا ئێمە نەفی کرابووینە ناو ئەم عارەبانە و ناچار بووین کە لەم جنووبە هەوا پیس و گەرمەسێرەدا ژیان بەرینەسەر؛ تۆ بۆچی؟ بۆچی نەتدەویست بگەڕێیتەوە؟ ( کەمێک وەستان) هەر لەسەر ئەو مەسەلەیەی باوکت؟

**فەرەیدوون:** شتی تریش، شتی تریش نارین.

**نارین:** فەرەیدوون، باوک نابێ ئەوەندە دڵڕەق و توندوتیژ بێ وەک تۆ باسی لێ دەکەی! من سەیرم پێ دێ: « باوک» کە ئەو هەموو سەروەتوسامانەی خۆی هەبێت، هەر شەش-حەوت مانگ جارێک دەرامەتو قازانجی قۆنتەراتێکی گەورەی دەست بکەوێت، چەندین وەستاو کرێکاری لەژێر

دەستدا بێت و بتوانێ مووچەیان بدات، وێڕای ئەوەش چەندین خانوو و بەرە و ریزەدوکانی لەناو شاردا هەبێتو هەموو مانگێک کرێیەکانی وەربگرێت؛ چ حەوجەی بەوە هەیە کە بێت، بەدرێژایی عومری گەنجێتیی کوڕەکەی، ئەو کوڕەی لە زەواق بنێت و هەراسانی بکات؛ زۆر لە کوڕەکەی خۆی بکات کە لە ئیشوکاری تایبەتی خۆیدا لەگەڵی بێتو یارمەتیی بدات؛ سەرەڕای ئەوەش، بێت لەسەر ئەوەی کە کوڕەکەی نەتوانێ گوێڕایەڵی داواکارییەکانی ئەو بێت لەگەڵی بکاتە شەڕ و هەرا و پێی بڵێ: « تۆ کوڕی من نیت» و لە ماڵ دەری بکات ! ئەو هەموو تەنگوچەڵەمە و مەینەتییەش لە ژیانیدا بخوڵقێنێ! من تێ ناگەم: « باوک» چ حەوجەی بەوە هەیە ؟

**فەرەیدوون:** ئەی کوڕەکە نارین؛ ئەی کوڕەکە ؟ ئەی کوڕەکە چ حەوجەی بەوە هەیە کە دووای دوو ساڵ تێپەڕبوون بەسەر ئەم رووداوە « بەسەر دەرکرانی» ، دووای دوو ساڵ خانەبەکۆڵی و « تامی ماڵو دایک نەدیتن» کە بەدرێژایی ئەو دوو ساڵەش هەر، هەمیشە لە ئوتێلان خەوتبێت، وە بەدرێژایی هاوینە گەرم و رەتێنەرەکان هەمیشە هەر کاری کردبێت و ئارەقی رشتبێت و خۆی خۆی ژیاندبێت؛ کەچی ئەمڕۆ بێت، لەجیاتی ئەوەی کە خۆی لەم ئاگرە، لەم جەنگە سامناک و بێ مانایە بە دوور رابگرێ، یا چارەسەرێک بۆ ژیانی خۆی بدۆزێتەوە، بەوپەڕی بێباکی و ویژدان ڕاحەتییەوە، خۆی بەدەستی خۆی، خۆی رەوانەی ناو ئاگری ئەم جەنگە خوێناوییە بکات !؟ ئەی کوڕەکە، نارین؛ کوڕەکە چ حەوجەی بەوە هەبوو!؟

( قەیرێ بێدەنگی. فەرەیدوون پیش دەخواتەوە)



**نارین:** فەرەیدوون، من چەند لە ژیانی تۆ ورد دەبمەوە: ژیانی تۆ لە جۆگەلەیەکی بریندار و لە هەمان کاتدا پڕ غروور دەچێ؛ کە بەتەنیاییەوە، بە ناو دەشتێکی چەپەک و سەوزدا گوزەری کردبێت.

**فەرەیدوون:** نارین، تەنیایی خەریک بوو بەتەواوەتی هەرەسم پێ بێنێ.

(قەیرێ بێدەنگی)

**فەرەیدوون:** سەیر ئەوەبوو نارین، من نەک تەنیا لەگەڵ ماڵەوە و کەسوکاری خۆم، بەڵکو هەر لەگەڵ هەموو کەسێک نەمدەتوانی، نەمدەتوانی کە باز بەسەر هەستی گۆشەگیری و تەنیایی خۆمدا بدەم. من هەمیشە، پێش ئەوەی کە ڕووداو و شتەکان تاقیبکەمەوە، هەستی نەتوانین و فیگاری لە ئاستیاندا دایاندەگرتم! پێش پەیوەندیکردنم، هەستی نەتوانینی پەیوەندیکردن و بێ مانایی پەیوەندیکردن، دڵو مێشکیان ڕنەک دەدام. ئەو هەستە ئەفسووناوی و قووڵ و سامناکەی، کە هەر لە منداڵییەوە تا ئەو ساتەی کە تۆم تیا ناسی، سەرتاسەری بوون و ژیانی منی داگرتبوو. من بەدرێژایی تەمەنی گەنجیم، تەماشام دەکرد هیچ شتێک، هیچ رێگایەک، هیچ پردێک نییە کە بوونی من بە دەوروبەرم، بە ژیان ببەستێتەوە. هەر کە خۆم لە ناو کۆمەڵێک خەڵکدا دەبینییەوە، دڵەڕاوکێ کەوەڕێی دەکردم: لە بێهوودەیی و بێ مانایی زیاتر، هەستم بە هیچی دیکە نەدەکرد. تەنانەت بەشداریکردن لە خۆشی و شادییەکانیش، زیاتر لە هەموو شتێکی دیکە وایان لێم دەکرد هەست بە غەمناکی و فیگاری بکەم. بە بیرم دێ، رۆژێکیان، ساڵی یەکەمی خوێندنم بوو لە ئامۆژگای مامۆستایان، هێشتا

باوکم دەری نەکردبووم، کوڕێکی پوورم بە بۆنەی ژنهێنانییەوە زەماوەندێکی ساز کردبوو، بانگهێشتی هەموو کەسوکاری خۆی بۆ زەماوەندەکە کردبوو، لەوانە منیش. ئێوارە، جلوبەرگی خۆمم کردە بەر بە نیازی ئەوەی کە بچمە زەماوەندەکە، کەچی، زۆر سەیر بوو، هەر کە لە ماڵ هاتمە دەرەوە، هێشتا نزیک گەڕەکەکەی ئەوان نەکەوتبوومەوە؛ هەر لەخۆمەوە هەستێکی نامۆ دایگرتم: هەستێکی ئەفسووناوی، لە ناخمەوە، لە هێزێک دەچوو- نازانم چی بوو- دڵی دەگوشیم، ڕێی لێ دەگرتم لەوەی کە بچم.. هەنگاوەکانی خاو کردمەوە. لە دڵی خۆمدا گوتم: «بچم چ بکەم؟». پێش ئەوەی بچم، دەمزانی چ دەکرێ، چ دەگوترێ، چ روو دەدا. پەشیمان بوومەوە. نەچووم. گۆڕستانێک لەسەر ئەو ڕێگەیە هەبوو، لامدایە ناو گۆڕستانەکە، چووم لەوێ، لەژێر درەختێک پاڵم دایەوە. کوڕە پوورەکەم، کە من گەلێکیشم حورمەت دەگرت، لەسەر « ئەو نەچوونەی من» ئیتر ببڕای ببڕ پێی نەهاویشتەوە ماڵمان. ( کەمێک وەستان) نارین گیان، سروشتی من، لە هەموو شتێک، لە هەموو ژیانمدا، هەمیشە هەر ئاوها بوو، هەمیشە هەر بەو هەستی نەتوانین و دوورەپەرێزیەوە ژیاوم. وەک ئەوەی کە لەناو رووبارێکیشدا بووبم و تینوێتیشم بە ئاوەکەی هەرگیز نەشکابێ؛ هەمیشە هەر هەستم بە ئازاری خنکانێک دەکرد کە لە تینوێتییەوە هاتبێ. ( پیش دەخواتەوە) ئێستا کە ئاوڕ لەم ژیانەی خۆم دەدەمەوە، وا هەست دەکەم کە من بەدرێژایی هەموو عومری خۆم هەمیشە گەڕاوم.

**نارین:** لە چی گەڕاوی؟



**فەرەیدوون:** لە شتێک کە هۆگری ببم، یا لە کەسێک کە خۆشم بوێ: بۆ ئەوەی چیتر هەست بەوە نەکەم کە بوونی من بێ مانایە و هیچ کەڵک و مانایەکم لە ژیاندا نییە؛ بۆ ئەوەی چیتر لەناو قۆزاغەی گۆشەگیری و هەستی بێ مانایی خۆمدا نەڕزێمەوە. من ئێستا بۆم دەرکەوتووە، هەڵبژاردنی تەنیایی، لە ئەنجامدا، چارەسەر نییە؛ هەر دەمانگەڕێنێتەوە.

**نارین:** دەمانگەڕێنێتەوە بۆ کوێ؟

**فەرەیدوون:** بۆ ناو کۆمەڵ، بۆ ناو ژیان.

**نارین:** چی دەمانگەڕێنێتەوە؟

**فەرەیدوون:** هەستی تەنیایی.

**نارین:** هەستی تەنیایی، یان خۆشەویستی و، پێویستی و..

**فەرەیدوون:** تۆ بڵێی تەنانەت ترس و برسێتیش. بە هەرحاڵ، چارە نییە: ناکرێ مرۆڤ هەر لەناو قۆزاغەی خۆیدا بژیت و هەر بە تەنیا غەم لە شت بخوات. ( کەمێک وەستان) ئەوەی کە جاران تێیدا دەژیام دۆزەخێک بوو. ئاخ نارین، ئەو دۆزەخە، چۆن نەیکوشتم! وەک ئەوەی بڵێی سەرتاسەری ساتە نائارام و گۆشەگیرییەکانم دەیانزانی کە من رۆژێک خۆری چاوانی تۆم لێ هەڵدێ! وەک ئەوەی بڵێی سەرتاسەری ئەو حەبی ئیسپرینانەی کە نیوەشەوان هەڵدەستامەوە دەمخواردن، هەروەها سەرتاسەری ئەو بوتڵە عارەقە غەمگینانەی کە هاودەمی شەوانی پڕ مرازی خۆکوشتنم بوون دەیانزانی کە رۆژێ لە رۆژان سەوزایی تۆ و جۆش و گوڕی تۆ، وەک لە ڕیشە و خاکی پڕ پیتی ژێر درەختێکەوە بۆ ناو گیانی درەخت سەرکەوێ: ئاوها بۆ ناو

گیانی مندا سەردەکەویت و چڵوپۆپم پێ دەبەخشیت و دەمگەشێنیتەوە ( بە دڵخۆشییەوە باوەش دەکاتەوە، وەک لە سەمایەکدا بێت) من بەختەوەرم. من لەگەڵ تۆدا زۆر بەختەوەرم. زۆر دڵخۆشم! دڵخۆشیی جۆگەلەیەکی بێناز و تەنیای دەشتێکی چەپەک کە لە ئاخرین ساتەکانی وشک هەڵگەڕانی خۆیدا ڕژابێتە ناو ڕووبارێکەوە.

**نارین:** (دەمودەست لە پڕمەی گریان دەدات، دەموچاوی خۆی لەناو هەردوو دەستی خۆیدا دەشارێتەوە)

**فەرەیدوون:** ( لێی نزیک دەبێتەوە. چەناگەی بە خۆشەویستییەوە بەرز دەکاتەوە) بۆ دەگریت، بۆ دەگریت نارین گیان!

**نارین:** ( پچڕ پچڕ، بەدەم گریانەوە) فەرەیدوون، بە چی شتێکی من دڵخۆشی؟ بە چی شتێکی من؟ بە ئیفلیجیی من و بەم دوو قاچە لەگۆکەوتووەی من دڵخۆشیت؟ بەوەی کە من تووشی ئەم سەرەنجامە تاڵ و ئەم چارەنووسە ڕەشەی ئەمرۆتم کرد؟

**فەرەیدوون:** (خاو دەبێتەوە، تووڕە) گەورەترین نوقسانیی ئینسان ئەوەیە کە ناتوانێ لە ناو هەقیقەتی خۆیدا بژیت!

**نارین:** من گەر بمزانیایە نیگاکردن و سەرنجدانم لەم چاوە پڕ حەسرەت و غەمانەی تۆ، بەم ڕۆژە سامناک و پڕ هەرەسەت دەگەیەنێ؛ چاوەکانی خۆمم کوێر دەکرد! گەر بمزانیایە من ئەو رووبارە نامۆیەم کە تۆ ئەمڕۆ، بەو هەموو خەیاڵمەزنیو پاکییەی خۆتەوە تێیدا دەخنکێی؛ هەر لە یەکەم ڕۆژەوە خۆم چک دەکرد. بەڵام ئاه.. فەرەیدوون.. کام پیاسەمان، کام پیاسەی ڕۆژەکانی سەرەتای یەکترناسینمان دەیانزانی کە بەم ڕۆژە ڕەشە دەگەین؟ کامە خۆشی و



توانەوەی ناو ماچەکانی ئەوەڵین هەفتەی ژووانەکانمان دەیانزانی کە ئاوها ئیفلیج، ژیانمان لێ دەبێتە سوغرە و مەینەتی و بارو بەڵا. کام لە ئێمە دەمانزانی؟ (بە هەنسکو گریانێکی زەبوونانەوە) فەرەیدوون.. لە پێکەوتنی من تۆشی لەپێ خست. ئیفلیج بوونی من تۆشی ئیفلیج کرد.

**فەرەیدوون:** ( بە شێلگیری و نەرمییەوە) وا مەڵێ نارین گیان. بەپێچەوانەوە: تۆ کلیلێک بووی دەرگای ژیانت بۆ کردمەوە. من لە ڕێگای تۆوە توانیم پەیوەندی بە ژیان دروست بکەم!.. نەء، من قەت ئەوەندەی ئەمڕۆی ژیانم، هەستم بە بەهێزی و دڵنیایی و سەربەستیی خۆم نەکردەووە.

**نارین:** ( بە دڵتەنگییەکی قووڵەوە) سوپاست دەکەم فەرەیدوون؛ دەزانم تۆ دڵم دەدەیتەوە، بەڵام تۆ ئێستا، تەنیا بەوەی، گەر چەند هەنگاوێک « لەم ژوورە» دوور بکەویتەوە و بگەیتە سەر ئەوەڵین شەقامی ناو ئەم بازاڕەی « دەرەوە» هەست دەکەیت کە تا چ ڕادەیەک « بەند کراو» و هەڕەشەلێکراوی، چەنێ ناڕەحەت و ڕاوەدوونراوی؛ تەنانەت هەست دەکەیت لە «سەربازێکی فیرار» زیاتر، هیچی تر نیت. (دەگرییێت).

**فەرەیدوون:** ئاخر ئەوەیە، نارین گیان: گەورەترین هۆی مەرگەساتی ژیان، گەورەترین هۆی خراپەکاری و بەدبەختییەکانی مرۆڤ لە ژیاندا ئەمەیە: لێناگەڕێن ئینسان بۆ خۆی لە ژوورەکەی خۆی دابنیشێت! (کەمێک وەستان، بە ئارامییەوە) نارین گیان، من مەبەستم ئەوە نیە کە لەگەڵ تۆ هەمیشە لە ژوورێک دانیشین و نەیەینە دەرەوە، بەڵام نارین، دڵە شیرینەکەم، ژیان ئەوەشمان پێ بە ڕەوا نازانێ..

ئەوەشمان پێ بە ڕەوا نازانێ!
(فەرەیدوون، لەسەرخۆ، سەرداگرتوو، بەدەم بیرکردنەوە، هەنگاو بەرەو دەرگای حەوشە دەنێ، لە نێوان قەرەوێلەکەی نارینو دەرگاکە، دوو سێ جاران هەر دێتو دەچێ: لەناو شڵەژانی بیرکردنەوەدایە، بەڵام هێمن و ئارامە. پاشان دەچێ لە قوژبنێکی ژوورەکەدا، لەسەر چیچکان، پشت بە دیوارەکە دەدات، سەری خۆی لە بەینی هەردوو دەستەکانی خۆی دەگرێ، تاو تاویش هەڵدەستێتەوە، دووبارە دەست دەکاتەوە هاتوچۆکردن. هیچ ئاگایەکی لە نارین نەماوە کە بە چاوەڕوانییەکی غەمگینەوە، تا رادەیەکیش بە ترسەوە، تەماشای دەکا. لە ناکاو کاتێ کە ڕووەو قەرەوێلەکەی نارین دەڕوا، دەست بۆ ئەو پاڵتۆیەی سەر سەری نارین، کە بە حەللاگەوە هەڵواسراوە، درێژ دەکا) هەست دەکەم سەرمامە. سەرمامە نارین!
**نارین:** فەرەیدوون گیان، چیتە ئەوە؟ هەر لە ماوەی ئەم یەکدوو دەقیقەیەدا، ڕەنگت گۆڕا و سیمات ڕەنگێکی دیکەی لێ نیشت؟ سەرمابوونی چی فەرەیدوون، من گەر نەخۆش نەبوومایە، لەگەرمان ئەم کراسەی بەریشم فڕێ دەدا. پەشۆکاو دیاری، فەرەیدوون! (کەمێک وەستان) بۆچی ئاوها لەناکاو، ڕەنگت هەڵبزڕکا؟
**فەرەیدوون:** (وەک ئەوەی ئاگاداری ئەم قسانەی نارین نەبێت، پاڵتۆکەی دەکاتە بەر، نوقمی بیرکردنەوەیە. دەست دەکاتەوە هاتوچۆکردن. پاشان، لە ناکاو، بە شڵەژاوییەوە بێ ئەوەی تەماشای نارین بکات) پێم بڵێ، نارین، یەک شتت لێ دەپرسم: تۆ لەگەڵ ئەوەدایت ئینسانێک بمرێ لەپێناو ئەوەی دوو ئینسان بژین ؟



**نارین:** (حەپەساوە).
**فەرەیدوون:** بۆ وەڵام نادەیتەوە؟
**نارین:** (وەک ئەوەی لە قسەکەی فەرەیدوون تێ نەگەیشتبێ و لە دەموچاوی فەرەیدووندا بە دووای مەبەستی پرسیارەکەیدا بگەڕێ).
**فەرەیدوون:** وتم: تۆ لەگەڵ ئەوەدایت کە ئینسانێک بمرێ لەپێناو ئەوەی کە دوو ئینسان ڕزگاریان ببێت؟
**نارین:** (وەک ئەوەی بیر لە مەتەڵێکی تەڵزماوی بکاتەوە، قەیرێک بێدەنگ، لە فەرەیدوون ورد دەبێتەوە).
**فەرەیدوون:** بە مەرجێکیش: تۆ دڵنیایت؛ دڵنیایت لەوەی کە ئەم دوو ئینسانە ڕزگاریان دەبێت!
**نارین:** دڵنیاشم کە ئەو ئینسانەی تر هەر دەبێ بمرێت؟
**فەرەیدوون:** ئا، مەرجە. بۆ ئەوەی تۆ دڵنابیت لەوەی کە ئێمە بە دڵنیاییەوە ڕزگارمان دەبێت! نارین، ئێمە گەر پارەکەمان دەست بکەوێ، ئیجازە و ناسنامە تەزویرەکانیش هەر ئێستا ئامادەن! ئامادەن.
**نارین:** ئۆهـ فەرەیدوون، هەمدیس کەوتیتەوە ئەم بیرکردنەوە سامناکە! (بە ترسو شڵەژانەوە) من لەناو چاوتا دەبینم: ئەم جارە بەڕاستتە. ئەم جارە پیلانێکی لەوەی پێشوو زۆر سامناکترە، پیلانێکی خوێناوییە: خەریکە سەرتاپای ڕۆح و گیانتی هێناوەتە خرۆشان.
**فەرەیدوون:** گوناهی گەورە و تاوانی گەورە هەمیشە سەرکەوتن و بە ئاوات گەیشتنی گەورەی بەدوواوەیە؛ دەزانی؟ (وەک ئەوەی لەگەڵ خۆی قسە بکات) من دوێنێ ئێوارە کە چوومە دەرەوە، بە فێڵی لێ بەجێمانی پاڵتۆکەم چوومە ئوتێلەکەم، لە ژووری ئوتێلەکە، لە هەمان ئەو

شوێنەی قاسەی پارەکەی لێیە، لای پیاوە عارەبە خاوەن ئوتێلەکە، کە دانیشتم؛ بەدرێژایی ئەو ڕێگایەی بەینی ئەم ژوورە و ئوتێلەکە، هیچ هەستێکم بە « فیراری »ی خۆم نەدەکرد. دەزانی! هیچ هەستێکم بە هەڕەشەلێکراوی و راوەدوونراویی خۆم نەدەکرد. هەستم بەوە نەدەکرد من و تۆ دوو ئینسانی بێچارە و لێقەوماوین! بیری ئەوەی کە «ئێستا خەریکم دەچم نەخشەیەک بۆ رزگاربوونی خۆمان دادەنێم، بیری ئەوەی کە ئێستا دەچم پیلانێک بۆ تاوانێکی گەورە دادەڕێژم» هەستێکی یەکجار گەورەی باوەڕبەخۆبوون و هێزی پێ بەخشیبووم، بە شێوەیەک کە بە هیچ جۆرێک هەستم نەدەکرد فیرارێکم و لەناو شەقامی شارێکی پڕ لە پۆلیسو ئەمنو جاسووسی جنووبدا بە ڕێگادا دەڕۆم! کە گەیشتمە ژووری ئوتێلەکە و لەگەڵ کابرای عارەب کەوتمە قسەکردن، لە بەینی تەواوکردنی قسەکانیدا، تەماشای قاسەکە و تەماشای دەموچاوی ئەوم دەکرد؛ لە دڵی خۆمدا دەمگوت: « دەبێ ئەم بیرەم بگاتە سەر، دەبێ ئەم بیرەم جێبەجێ ببێ.. بە ئاوات بگەین!»

( لەسەر کورسییەکە، بە نائارامییەکی پڕ لە جۆشەوە، دادەنیشێ )

**نارین:** فەرەیدوون گیان، ئینسان هەمیشە بە خەیاڵەوە بژیت، ناکرێ. بەڵام جێبەجێکردنیشی، شتێکی ئەستەمە؛ تاوانە فەرەیدوون. من رێت نادەمێ، هەرگیز رێت نادەمێ!

**فەرەیدوون:** ( هەڵدەستێتەوە) بەڵام ئەمە تاقە چارەسەرێکە!

**نارین:** ( بە ترسەوە) فەرەیدوون، توخوا دانیشە، من دەترسێم. وەرە تەنیشتمەوە توخوا، باوەشم پیاکە. وەرە،



توخوا.

**فەرەیدوون:** هەمیشە « گوناه کردن» چارەسەر بووە! هەمیشە « گوناه کردن» چارەسەر بووە!

**نارین:** ( دەلاڵێتەوە) من دەترسێم.

**فەرەیدوون:** ( دەستەکانی لەسەر سنگی باوەش کردووە، تەماشای خاڵێکی دوور دەکا) تۆ ناترسێی. ڕاڕایت، وەکو ویژدانم « ویژدانیش هەموومان ترسنۆک دەکا».

**نارین:** ( بە ترسەوە، دەلاڵێتەوە) من لەناو چاوتا دەبینم، دەزانم: ئەم جارەیان بەڕاستتە.

**فەرەیدوون:** ( بەدەم هاتوچۆکردنەوە هەموو هەستو نەستێکی لای نارینە، بە شلەژاوییەوە، لەبەرخۆیەوە، وەک ئەوەی لەگەڵ خۆی بدوێ) قسە بکە، قسە بکە نارین. بزانم چ دەڵێی!

**نارین:** ( بە سڵۆکی و گریانەوە) من دەتبینم، فەرەیدوون، تۆ پێش ئەوەی ئەم کارە بکەیت؛ دەتبینم.. دەتبینم کە چۆن لە نیوەشەوێکی درەنگدا، دەمەوکاتی نوێژکردنی بەیانییان، بە خۆت و پاڵتۆکەتەوە، چەقۆیەکی زلت لەژێر پاڵتۆکەت شاردۆتەوە، بە شەقامەکەی لای حەمامەکەوە وەردەسووڕێیتەوە و خۆت دەگەیەنیتە ئوتێلەکە. من ئێستا تەپەتەپی هەنگاوە شلەژاوەکانتم گوێ لێیە، گوێم لێیە کە چۆن بەسەر پێپیلکەی ئوتێلەکە سەردەکەویت و خۆت دەخزێنیتە ئەو ژوورەی کە قاسەکەی لێیە. من ناوەوەی ئوتێلەکەم نەدیوە، بەڵام ئەوەندەی تۆ بۆمی باس بکەی، وەک شوێنێک کە دیبێتم، لەبەر چاومە. لەبەر چاومە چۆن بەدزیەوە، بێ خشپە، لەو کاتەی کە خاوەن ئوتێلەکە لە ژوورە بچووکەکەیدا خەریکی نوێژکردنی

بەیانیە، تۆ بەئەسپایی، بە پێدزکە، بێ خشپە، لێی دەچیتە ژوورەوە و دەرگـاکـەشی لە دیوی ژوورەوەڕا، بە هێـواشی لەسەر دادەخەیت. لە کاتێکدا «ئەو بەستەزمانە» پشتی لە تۆیە و ڕووی لە خودا خەریکی نوێژکردنە، تۆ لە دوواوەڕا، بە دەستی چەپت دمی دەگریت و بە دەستی ڕاستیش، تا لە تواناتدایە، ئەو چەقـۆ دەم ژەهراوییـە ڕۆ دەکـەیتـە بڕبڕەی پشـتـیـیـەوە. ئاخ.. فـەرەیدوون.. من دەتبـینـم کـە تۆ لە دوواوەڕا، چۆن ئەم پیـاوە بێگوناهە دەدەیتـە بەر چەقـۆ و چۆنیش پاشان بەپەلەپرووزێ دەچیت قاسەکەی دەکەیتەوە، پارەکـانی لێ دەردێنی و بەپەلەش دەرگـاکـە دەکـەیتـەوە و دەڕۆی؛ ئەم مـەیتـە خـەڵتـانی خـوێنەش لە ژوورەوە بەجێ دێڵی. من دەتبینم.. دەتبیـ...

**فـەرەیدوون:** ( بە هەرەسهێنانەوە، یەک بە دەنگی خۆی هاوار دەکا) بەەەەس!

( دادەشکێتـەوە، بە هەردوو دەست گـوێی خـۆی گـرتووە، ئەژنۆی چەپی لەسەر عەرزە)

لەم لەحزەیەم قوتارکە نارین! لەم بیرکردنەوەیەم قوتارکە! قوتارم بکە!

**نـاریـن:** (دەشڵـەژێ. بە هانـای دەچێ، دەسـتی بۆ درێژ دەکـا. لە ناوک بەرەو سـەرەوەی کـەوتۆتە سـەر سـەرینی قـەرەوێڵـەکـەی فـەرەیدوون. دەلاڵێـتـەوە) بەس ئـازارم بدە توخوا، فـەرەیدوون گـیـان، وەرە لامـەوە. دەسـتت! هەڵسـە! دەزانم فەرەیدوون، دەزانم: دەمێکە بە ئارامییەوە لە یەکتری ڕانەماوین! تۆ خەریکە هەقیقەتی خۆتت بیر دەچێتەوە!

( فـەرەیدوون لە باوەشی نارین‌دایە: قـاچی لەسـەر عـەرز. نارین سـەری لە باوەش دەگرێ، سـەروقـژی دەلاوێنێـتـەوە.



پاشان بە هەر دوو دەستی، سەری بەرز دەکاتەوە)

**نـاریـن:** تەماشـای چاوم بکە، فەرەیدوون! ( فەرەیدوون ناتـوانێ تەمـاشـای بکات. نارین، قـەیرێک هەر لێی ورد دەبێتـەوە) دەزانی تۆش لاواز بوویتە! چاوەکانت کە جاران وەک دوو گـوڵە مـێـخـەکی زەرد گـەشـەیان دەهات، ئەمـڕۆ ژاکاو.. بەقووڵدا چوون.

( فەرەیدوون، بە ماندوێتییەوە سەری بەردەداتەوە سەر شانی نارین. نارین بە ئاوازێکی پڕ لاواندنەوە).

**نـاریـن:** بە قـسـەی گـوڵ... فـەرەیدوون .. مـن ئەم چەند ڕۆژە لەناو جێ کەوتبووم، ئاگام لە هەمـوو شـتێـک بڕابوو.. تۆ ئەم ماوەیە گوڵی ناو مەرکانەکانت ئاو داون؟

**فــەرەیدوون:** ( سـەری بەسـەر شـانی نارین‌دا گـرتووە. بێ وەڵام)

**نارین:** ( بە نەرمی و خۆشەویستییەوە سەری فەرەیدوون بەرز دەکـاتەوە. دەست بە ناو قـژی فـەرەیدوون دا دەگـێـڕێ) ئاوت دەدان؟

**فــەرەیدوون:** ( وردە وردە، بە نەرمـیـیـەوە، دادەخـزێتەوە پێینگانی قەرەوێڵەکەی نارین).

**نـاریـن:** توخوا، تۆ بەهێزتری، لایەقـتری لەوەی کە ئاوها بێ ورە دەتبینم!

**فەرەیدوون:** دەڵێی چی نارین؟

**نـاریـن:** گوڵەکان، گوڵی ناو مـەرکانەکان؛ ئاوت داون ؟ هەر لای پەنجـەرەکـەن، لەبەر خـۆرەتاون؟ گـوڵەکـانمانت بیرچۆتەوە، فەرەیدوون!

**فـەرەیدوون:** ( لە پێینگانی قەرەوێڵەکەی نارین، پشـتی داوەتە قـەرەوێڵـەکـە، رووەو دەرگـای حـەوشـە. قـاچەکـانی

دریژکردوون) ئاوم داون، ئاوم داون نارین.
**نـاریـن:** ئاه! خۆزگا پێم هەبووایە، یا قاچەکانم لەم دەمو دەستە بکەوتنایەتەوە جوولە و بمتوانیایە بچمە ئەودیو: گوڵەکانمان ببینم! تەماشایان بکەم! کە دەگەشامەوە! بەبیرتە فـەرەیدوون: یەکـەم مـانگی یەکـتـری‌ناسـینمـان بوو، ئێـوارەیەکی ڕۆژی پێنج‌شـەممە بوو، تۆ ئیـجـازەیەکی دوو ڕۆژیت وەرگـرتبوو، هەر بە جلوبەرگی سـەربازییـەوە هاتیـتـە گوندەکەم و لە قوتابخانەی گوندەکەمەوە بەیەکەوە هاتینەوە ماڵ. کە هاتینەوە ماڵ، باوکم- بەڕەحمەت بێ، کە تۆم پێی ناساند ( لە ژووری ئەودیو، لە ژووری گوڵەکان بووین) تۆ لە شەرمان ڕەنگت سوور هەڵگەڕا. بەبیرت دێ؟ بێ مەتەق، لە بەردەم ویقارِ و دڵنزمیی باوکمدا ڕاوەستابوویت، لەتاو تەریق‌بوونەوە و شەرمی یەکەمین دیدارت، پەنجەکانی خۆت هەڵدەپشـافتن؛ نەتدەزانی چ بڵـێی، چ بکەی. دەسـتت بۆ گوڵی یەکێک لە مەرکانەکانی بەر پەنجـەرەکە درێژ کرد و نائاگایانە رووت لە باوکم کرد و گوتت: « ئەمەیان گوڵێکی جوانە، مام مستەفا!» بەبیرتە فەرەیدوون؟ باوکیشم وتی: « پێشکەشت بێ!» تۆش وتت: سوپاس! باوکم وتی: بیبە، بە مەرکانەوە بیبە؛ پێشکەشت بێ.
**فەرەیدوون:** ( بە ئاراممییەوە) منیش وتم: « خانووم نیە. من خانووم نیە!»
**نـاریـــن:** بەبیـرتە فـەرەیدوون؟ پاشـان، دووای چارەگـە سەعـاتێک چوویت دۆڵکەیەک ئاوت هێنا و پرژاندتە سـەر گوڵەکانەوە. باوکم ئەو کاتە بە توانجێک سەیرێکی منی کرد و بە زەردەخـەنەیەکی شـیـرینەوە، گـوتی: « لە سـایەی گوڵێک، هەموو گوڵەکان ئاو دەخۆنەوە!» هەستم کرد تۆ ئەو



کات دیسانەوە کەمێک تەریقەوە بووی، منیش هەر خۆم پێ ڕانەگیـرا و تەریقـەوە بووم. تۆ لە وەڵامـدا گـوتت: ( ئەمـە یەکـەم جـارە لە ژیانمدا گـوڵ ئاو دەدەم، مـام مـسـتـەفـا ) بەڕاستی فەرەیدوون، یەکەم جارت بوو لە ژیانتدا گوڵت ئاو دەدا؟
**فــەرەیدوون:** لەپێناو تـۆ. تۆ فێـرت کردم. تۆ فێری ناوی گوڵ و داروەدەوەنەکانی ئەم سروشتەت کردم. من گەر ژووان و دانیـشـتنەکـانی ژێر سێـبەری درەختـەکـانی سـەر ڕێگەی گـوندەکـەت نەبوونایە، گـەر پیـاسـەی ناو چیـمـەنو دارستـانەکانمان نەبوونایە؛ هەرگیـز دار چوالەم لە دار سێو، دار سـێـوم لە هەرمێ، بەڵاڵووکم لە چنار، وەنەوشـەم لە شەوبۆ جوێ نەدەکردەوە.
**نارین:** ( سەروقژی فەرەیدوون دەلاوێنێتەوە) فەرەیدوون، ئەو گوڵە سوورەت بیرهێنامەوە کە لە ئەوەڵین ژووانماندا لە قژم بەستبوو. بە بیرتە فەرەیدوون؛ ناو پاصەکەت بە بیرە؟
**فەرەیدوون:** کام پاص؟
**نـاریـن:** ئەو پاصەی کە لە گوندەکەمەوە دەیهێناینەوە بۆ ناوشار. ئێوارەیەکی درەنگ بوو. یەکەمین جار بوو کە ئاوها لە تەنیـشت یەکـتـرییـەوە لەسـەر یەک کورسی دابنیـشین و دەست بخەینە دەست یەکترەوە. تۆ هەر بە جلی سەربازییەوە بوویت. دیار بـوو تەدریبی ئێـوارەی ئۆردووگـا بێ هێـز و شـەکـەتی کـردبوویت. من مـریشکێکم لە مـاڵەوەڕا بۆت سوورەوە کردبوو، لەگەڵ دوو سەموون، لەناو قاپلەمەیەک، لەگەڵ خۆما هێنابووم بۆ دەوام ( بۆ مەکتەب)، هەڵم گرتبوو بۆ ئەو سـاتـەی تۆ دەبینم. دەمـزانی کـە لە تەدریب دەگەڕێیتەوە و یەکسەر دێیتە لام، برسی و هیلاکی! لەناو

پاصەکە، بە جووتە، لەسەر یەکێک لە کورسییەکانی دوواوە دانیشتبووین. پاصەکە تەنیا یەکدوو پیاوی عەگال بەسەری عارەب و هەندێ منداڵو دوو سێ ژن لە کورسییەکانی پێشەوەدا دانیشتبوون. پاصەکە بەسەر جادە خۆڵەکەوە، بە دەشتێکی چۆڵدا، هەڵتەک هەڵتەکی بوو! من گوڵێکی سوورم لە لاجانگی چەپم بەستبووو (کەمێک وەستان) پارچەیەکی مریشکەکەم لێ کردەوە و ویستم بیدەمە دەستت، تەماشاتم کرد: قەیرێک هەروا رامابوویت و چاوت لە گوڵەکە نەدەترووکاند، من دوو سێ جاران چاوی خۆمم داگرت و تەماشاتم کردەوە، کەچی تۆ هێشتا چاوت لەسەری لانەبردبوو. من تەریق بوومەوە، دەزانی؟
(خۆر هەڵدێ. دەرکەوتنی یەکەمین تاڵە تیشکەکانی خۆر لە پەنجەرەوە سەرنجی نارین رادەکێشێ، بەشێکی ژوورەکە زێڕەوشان دەبێ).
**نارین:** ئەوا! خۆر هەڵهات، فەرەیدوون. خەوت دێ؟
**فەرەیدوون:** ( ماندوو، شانی کەمێک بە لای نارین‌دا لار کردۆتەوە).
**نارین:** فەرەیدوون!
**فەرەیدوون:** ( بە کەمێک راچڵەکینەوە) ها نارین!
**نارین:** دەزانم خەوت دێ.
**فەرەیدوون:** نەء، خەوم نایێ، بێدارم نارین گیان. تەنیا پێڵووەکانم لەسەر یەکتر دانابوون. بێدارم. ( لە ناکاو دەگەشێتەوە) ئەڵڵاهـ.. چەنێ جوانە! ئەوەڵێن تاڵە تیشکەکانی خۆری بەیانییان کە لە پەنجەرەوە دەڕژێنە ژوورێ؛ چەنێ جوانە! سەیرکە! دەڵێی دەیانەوێ هەر هەموو جوانیی ژیان لەم ژوورەدا کۆ بکەنەوە!



( کەمێک بێدەنگی. هەردووکیان لە تیشکە زێڕینەکانی خۆر رادەمێنن).
**نارین:** ئەوا رۆژێکی دیکەش لە غەریبیدا بەسەر عومری گەنجیمان رابورد. فەرەیدوون، من کاتی بەیانییان، لە هەموو کاتێکی دیکە زیاتر هەست بە غەریبی دەکەم، تۆش وایت؟ کاتی بەیانییان، کە ئاوها ئەوەڵێن تاڵە تیشکەکانی خۆر دەبینم، هەستێکی زۆر دڵآزار و توندی غەریبی دامدەگرێ. لەم کاتانەدا وا هەست دەکەم کە بەدرێژایی عومرم هەر لە غەریبیدا ژیاوم، وەک ئەوەی هەر لە یەکەم چاوپشکووتنمەوە بە چیا و کەژ و درەختەکانی شارەکەی خۆمان، هەر لە یەکەم چاوپشکووتنمەوە بە کەسوکاری خۆم؛ ئیتر ببڕای ببڕ چاوم پێیان نەکەوتبێتەوە و لێیان بێ بەری کرابم ( بە ئاوازێکی پرسەدارانە) فەرەیدوون، بەڕەحمەت بێ، باوکیشم هەر وابوو. هەموو بەیانییەک، کە بە یەکەوە: من بەرەو گوندەکەم و ئەویش بەرەو « گەڕان بە دووای کار»؛ کاتێ لە ماڵ دەچووینە دەر، هەر کە دەگەشتینە سەر شەقامەکە، ئاگام لێی بوو: هەستێکی غەریبیی زۆر قووڵ دایدەگرت. سەری بڵند دەکردەوە، بە حەژمەتەوە، بە برینێکی قووڵی پڕ لە نسکۆوە، ئاهێکی حەسرەتاویی هەڵدەکێشا و دەیگوت:« بەیانیت باش، ئەی غەریبی!» ( بە نەرمییەوە لە پرمەی گریان دەدا) بەرەحمەت بێ! هەموو بەیانیەک ئەم قسەیەی دووبارە دەکردەوە.
( دەنگەدەنگ و هەرایەک، بە نزمییەوە، لە دەرەوەڕا بەرز دەبێتەوە. لەناکاو، توند، زۆر بە پەلە، لە دەرگا دەدرێ. هەردووکیان رادەچڵەکن. تەماشای یەکتر دەکەن).
**نارین:** کێیە بەم وەختە؟

**فەرەیدوون:** پشتیوان کە دێ، ئاوها لە دەرگا نادا!
**نارین:** تۆ مەچۆ فەرەیدوون! ( لەسەر قەرەوێڵەکەی، بە ئەزیەتەوە، دەکەوێتە جووڵە جووڵ) خۆت بشارەوە!
**فەرەیدوون:** ( پاڵتۆکەی دادەکەنێ، بە ئارامییەوە رووەو دەرگا دەڕوا).
**نارین:**( بەپەلە و ترس و شڵەژاوییەوە، بەڵام بەئەسپایی) تۆ مەچۆ فەرەیدوون! مەچۆ! خۆت بشارەوە!
**فەرەیدوون:** ( دەرگاکە دەکاتەوە) پشتیوانە!
**پشتیوان:** ( بە شڵەژاوییەوە، خۆی دەکوتێتە ژوورەوە).
**فەرەیدوون:** ( بە شەکەتییەوە) بەخێر بێی پشتیوان!
**پشتیوان:** دەمزانی هەر لە ماڵەوەی! چارەسەرێکی خۆت بکە فەرەیدوون! زوو! لێرە مەمێنە!
**فەرەیدوون:** ( وەک ئەوەی بەدەم خەونەوە قسە بکات) بۆ!؟
**پشتیوان:** لێرە مەمێنە!
**نارین:** ( بەپەلەپرووزێ ) چی قەوماوە کاک پشتیوان؟!
**پشتیوان:** ئەم زەنا زەنایەی دەرەوەتان گوێ لێ نیە؟
(فەرەیدوون بەرەو شوێنی پێشووی خۆی هەنگاو دەنێ. پشتیوان روو دەکاتەوە فەرەیدوون)
چی سەرسووچی کۆڵان و شەقاماکانی ئەم ناوە هەیە، بە « قووات خاصە» و « ئەمن» و « جەیشی شەعبی» گیراوە، فەرەیدوون! زووکە! لێرە مەمێنە! من بە کۆڵانە تەنگەبەرەکەی تەنیشتتانەوە خۆم بە ماڵی ئێوەدا کرد، کەس نەیبینیم. من ئێستا دەڕۆم، درەنگە، دەچمە دەوام. تۆ لە دووای من، کە من دەچمە دەرەوە؛ دەتوانی بە هەمان ئەو کۆڵانە تەنگەبەرەی تەنیشتتانەوە خۆت قوتار بکەیت؛



وەرچەرخێوە، هیچ خۆت مەشێوێنە. ئەو کۆڵانە، چۆڵە. کەسی لێ نیە، تا دەگەیتە مەیدانی نزیک پردەکە. لەوێوەش بە ئاسانی دەتوانی خۆت دەرباز بکەی. ئەولا- لای پردەکە، من تازە لەوێوە بەرەو ئێرە وەرسووڕامەوە؛ کەسی لێ نیە، ئارامە. دڵنیابە! دامەنیشەوە فەرەیدوون! زووکە؛ لێرە مەمێنە!
(ژاوەژاو و دەنگە دەنگەکە بەرزتر دەبێتەوە)
**نارین:**( تەماشای فەرەیدوون دەکا، بە لێو هەڵلەرزین و گریانەوە، وەک ئەوەی، ئەوەی دەیڵێ ئاخرین چەکی بێ لە دەستی مابێ) راست دەکا؛ فەرەیدوون!
**پشتیوان:** فەرەیدوون، تۆ ئەوا بۆ دوو هەفتەی رەبەق دەچێ بە فیرار لە قەڵەم دراوی! بێن؛ دەتگرن؛ دەتبەن؛ گوللەبارانت دەکەن! دامەنیشەوە فەرەیدوون! راکە: لێرە مەمێنە! من دەڕۆم.
**فەرەیدوون:** ( پشتی بە قەرەوێڵەکە داوە، رووەو دەرگا. وەک ئەوەی گوێی لە هیچ نەبووبێ، بێ وەڵام، تەماشای دیوار دەکا).
**نارین:** ( بە هەترەشچوون و سامناکییەوە، بە هێزی لەقیژەدانێک، بەڵام بەئەسپایی، بە کوڵی گریانەوە) راست دەکا! راست دەکا فەرەیدوون!
**پشتیوان:** ( لە دیوی دەرەوەدا، لە توێی دەرگاوە سەر دێنێتەوە ژوورەوە. بە دەنگێکی کەمێک بەرزتر، بەپەلە و بە ترسەوە) دەرەوە هەرایە، فەرەیدوون. دەرەوە مەرگەساتە. مەرگەساتە!
**فەرەیدوون:** ( تەماشای دیوار دەکا، بە دەنگێکی پڕ متمانە و بریندارەوە).. دەزانم.

(غەوغاو دەنگە دەنگەکە وردە وردە بەرزتر دەبێتەوە. وێڕای ئەوە، تەپەتەپی چەند دەنگێکی تێک قژقژاو، کە لە دەنگی پێی گارِانێک دەچێ، لە نزیکەوە دەکەوێتە بەر گوێ. هەروەها دەنگی سوارکردنی دەستەیەک کلاشنکۆف. شریقەی دەرگا. پاشان چەند تارماییەک بە دەنگە دەنگێکی سامناکەوە، لە لای دەرگاوە، بە دیار دەکەون. نارین بە هەرەس و سامناکییەوە لە پرمەی گریان دەدا).

**پەردە**

**کۆپنهاگن، پاییزی ١٩٨٦**

*** ئەم شانۆنامەیە، لە ساڵی ١٩٨٧ لە «کۆپنهاگن»، بنکەی (یەکگرتن) چاپ و بڵاوی کردۆتەوە.**



# گۆڕغەریبەکان

دیمەن: ناو شاخو داخێک.
کات: ئێوارەیە.

کەسەکان:
- پیرەژنێکی ئیفلیج: جلوبەرگێکی ڕەنگاوڕەنگی لەبەرە.
- **جوامێر:** گەنجێکە لە تەمەنی سیساڵیدا.
- **شەیدا:** گەنجێکە لە تەمەنی بیستوپێنج ساڵیدا.
- **ئەردەڵان:** گەنجێکە لە تەمەنی بیستوپێنج ساڵیدا.
- **نێرگز:** کچێکە لە تەمەنی بیستوپێنج ساڵیدا.
- لاڵێک لە تەمەنی دەساڵیدا.
- دەنگی بڵندگۆ.
- پشیلەیەک.

«کە پەردە دەکرێتەوە، هەموویان بێدەنگن»



**پیرەژن:** ئەرێ ئەو بۆنە ناخۆشە چیە لەم ناوە دێ؟
**جوامێر:** ( بەتووڕەییەوە ڕووەو پیرەژن) تۆ بۆچی لێمان ناگەڕێی کەمێک بەهێمنی بیر بکەینەوە؟ دە ماوەیەک دەمت داخە و هیچ قسە مەکە!
**نێرگز:** تۆ یەکجار زۆر حەزت لە منگەمنگی بێ واتایە، پیرەژن.
**ئەردەڵان:** لەم سێکوانەدا پیربووین هێندەی بۆنی غەریبیی یەکتر بکەین. (ڕووەو جوامێر) ئەوەندە بیری لێمەکەوە، جوامێر!
**جوامێر:** نا، بەڵام من دڵنیام کە ئێرە ئەو جێیە نیە کە دەمانویست ڕووی تێ بکەین!
**شەیدا:** ئێمە دەمانویست ڕوو لە کوێ بکەین؟
**جوامێر:** نازانم (ڕووەو شەیدا) ئەمە چیە؟ ئا گەزەیەکم بدەرێ لەم سێوە.
**شەیدا:** سێو نیە، شیعرە.
**نێرگز:** منیش زۆرم تینووم، یەکجار تینووم.
**ئەردەڵان:** هەر چۆنێک بێ، ئێمە تەنیا لە یەک شت زۆر دڵنیاین، ئەویش ئەوەیە کە دەمانویست بچینە «شوێنێک» و ڕزگارمان ببێت.
**پیرەژن:** خۆ ئێمە لە سەرەتادا ژمارەمان یەکجار زۆر بوو، هەر ئەوەندەی ئێستا نەبووین!
**شەیدا:** (بەتەوسەوە) تۆ مێژووی تەنانەت مێردەکانیشت زۆر بەباشی لەبیر ماوە!
**ئەردەڵان:** هەر یەکە و شوێن پێی ئەوی دیکەی هەڵگرت.
**جوامێر:** یەکە یەکە.
**ئەردەڵان:** جووت جووت.

**شەیدا:** کۆمەڵ بە کۆمەڵ.
**پیرەژن:** بە سواری لۆری.
**جوامێر:** بە سواری تەراکتۆر.
**جوامێر:** بە پێ.
**ئەردەلان:** بە سواری کەر.
**شەیدا:** بە سوار پشتی مێژوو و یادگارەکانمانەوە.
**نێرگز:** تا گەیشتینە ئێرە و ئاوهامان بەسەردا هات.
**لالـە:**(هەر دوو چنگی لە کەپۆڵی خۆی گیردەکات و بە دەنگی بەرز دەناڵێنێ).

(بێدەنگی)

**جـوامـێـر:**( تەماشەی پشیلە لاوازەکەی تەنیشت لالە دەکات) ئەم پشیلەیە ئەگەر نەیکوژین، دەمرێ!
**نێـرگـز:** دوێنێ شەو، لە خەو ڕاچلەکیم « وامزانی لە ماڵەوەم» چووم تەلەفۆنێک بۆ دایکم بکەم، لەم ناوە- لە نزیک ئەو تاشە بەردانەدا- دەستێکم بینی، لە زەوی دەرچوو بوو.. بە دووای ناندا دەگەڕا!
**شەیدا:** منیش بە هەمان شێوە، دەزانی؟ لە هەمان شوێندا قاچێکم بینی، بە دووای ئازادیدا دەگەڕا.
**پیرەژن:** خۆزگەم بە باجی زلێخا. گیانی شاد بوو. ئێستا بۆ خۆی گەیشتۆتە بەهەشت.
**نێرگز:** تۆ پاسکیلەکەت چی لێکرد، ئەردەلان؟
**ئەردەلان:** من؟ هەرگیز پاسکیلم نەبووە.
**پیـرەژن:** ئینجا با پاسکیلیشی هەبێ؛ داخۆ بە پاسکیل دەتوانن بۆ کوێ بچن؟
**نێـرگـز:** من بیر لەوە ناکەمەوە کە بگەمە بەهەشت، پیرەژن. هەروا پرسیارێک بوو کردم.



**پیرەژن:** ئەی بیر لە چی دەکەیتەوە؟
**نێرگز:** لە جەژن.
**شەیدا:** من بیر لە پەپوولەیەک دەکەمەوە کە لەبەر ژەنگی سەر باڵەکانی ناتوانێ بفڕێ.
**نێرگز:** کاتێ ئەوێمان بەجێ هێشت، ڕەمەزان بوو.ئێستا دەبێ جەژن بێ.
**شـەیدا:**(ڕووەو جوامێر، کە لەسەر تەلاشەبەردێک دانیشتووەو کەپۆلی خۆی لەناو دەستەکانی خۆی ڕاگرتووە) ئەی تۆ بیر لە چی دەکەیتەوە، جوامێر؟
**جوامـێر:** من، باشتر وابوو هەر لە بنچینەوە لە ولاتێکی دیکەدا لەدایک بوومایە.
**ئەردەلان:** تۆ وادەزانی ئەگەر لە ولاتێکی دیکەدا لەدایک بوویتایە، بەختەوەر دەبووی؟
**جوامێر:** بێگومان.
**ئەردەلان:** کەواتە هەموو شتێک ڕێککەوتە.
**جوامێر:** بەڵێ، « ڕێککەوتی لە دایکبوون»
**نێـرگـز:** بەلام مـرۆڤ هەر لەو ساتەوەی لەدایک دەبێ، ئیدی بەرپرسیارییەکی دەکەوێتە سەر شان.
**جوامێر:** بەرپرسیاریی هەڵبژاردن.
**شەیدا:** بەرپرسیاریی داهێنان.
**ئـەردەلان:**( دەست لە ملی نێرگز دەکات و دەمی ماچی بۆ درێژ دەکات) بەرپرسیاریی خۆشەویستی...
**نێـرگز:**( خۆ لەدەست ئەردەلان ڕادەپسکێنی، بە تووڕەیی و گازاندەوە) ئەی ئەم پیرەژنە؟
**جوامێر:** ئێ؟
**نێرگز:** چی لێ بکەین؟

**لاڵـە:**( بە میهرەبانی و کەساسییەوە، بە دەنگێکی ئاڵۆز و پڕ لە شـپـرزەییـەوە ڕادەکـاتە لای پیـرەژن، دەسـتی لە مل دەکات و بە گریانەوە دەیلاوێنێتەوە).
**پیـرەژن:** (دەلالێتەوە) بەجێم بێڵن، تکایە! لەمەوبەریش پێتانم وت، ئێوە بۆ خۆتان بڕۆن، بەجێم بێڵن!
**لاڵە:**( دەستی لە ملی پیرەژنە و دەگری).
پیـرەژن( بە گریانەوە) کـوێراییم دایە، خـۆ من لە غـەمی پێنج کوڕە لاوە سمێڵ سووسنییـەکانی خۆمدا نیم، من لە غەمی ڕەز و باخچەو کانیاوەکانم.. کوێراییم دایە، دەترسم ئەوانیش ئێستا وشک داهاتبن و کوێر بووبێتنەوە.
**جـوامـێـر:** من لەوانەیە دەمـێکی دیکە بڕۆم، ئێـوە بەجێ بێڵم.
**لاڵـــە:**( لەناکـاو ڕادەچلەکێ، هەڵدەسـتێـتەوە، گـوێ بۆ دەنگە دەنگێکی دوور ڕادەگرێ. لەترسان دەمی داپچڕیوە).
**ئـەردەڵان:**( تەماشای دوور دەکات و دەست درێژ دەکات) تەمـاشـا کـەن، تەمـاشـا کـەن! ئەوە هەمـان پۆلیـسـە بەدفەساڵەکەی جاری پێشووە( هاوار دەکات) های.. کابرا، چیت لێمان دەوێ، دیسان؟
**پیـــــرەژن:** ( بە دەنگەدەنـگ و هەرایەکـە پەشـۆکـاوە، ڕووەدکاتە نێرگز) ئەرێ تـورک کوردی دەزانن؟
**نێرگز:** نەء، تەنیا عەرەبی و فارسی دەزانن.

(لە دوورەوە، وردە وردە دەنگی پێی لەشکرێکی سـەربازی دێت، دەنگی چەک و چەکداران، پاشان دەنگێکی ناقـۆڵا، دەنگێکی سەربازانە، لە بڵندگۆوە، لە دوورەوە دەشیرێنێ).
**دەنـــگ:** ئێرە دەنگی ئاسمانە، دەنگی پۆلیس، دەنگی



دیموکراتیەت...
(هەمـــوویان خـــۆیان داوەتە پاڵ یەکـــتــر، گـــۆیان هەڵخستووە).
**دەنـــــگ:**( لە بڵندگـۆوە، لە دوورەوە دەشـیـرێنێ) ئێـرە دەنگی ئاسمانە، دەنگی دێزازێر... ئەی هاونیشتمانانی خۆشـەویسـتی ئەم سـەر زەمـینە سێ سـووچە! تکاتان لێ دەکـەین، ئەمـە دووایین جـارە پێـتـانی ڕادەگـەیەنین :« ئەم سەرزەمینە بە یەکجاری چۆڵ بکەن!». ئەگەر بێتوو تا نیو سـەعـاتی تر ئەم ناوە چۆڵ نەکـەن، ئەوا هەڵیکۆپتـەرتان دەنێرینە سەر!
**لاڵــە:** ( لە شـوێنی خـۆیەوە بە پەلەپەل، بەچڕنووک زەوی هەڵدەکۆڵێ).
**پیرەژن:** نەکەی، جارێ نا! جارێ نا!
**جـوامـێـر:**( ڕوودەکـاتە ئەردەڵان) من پێش ئەوەی بڕۆم و بەجـێـتـان بێـڵـم، حـەز دەکـەم بزانم؛ ئێـوە ئەم پیـرەژنە دەگەیەننەوە «مەهاباد»، یان نا؟
**ئـــەردەڵان:** بڵێم چی، براله؟ ڕۆژەکان یەکجار زۆر بەسەر یەکتردا کەڵەکە بووینە.
**جوامێر:** تەنیا تۆ لەگەڵی دەچی، یان هەمووتان؟
**ئـــــەردەڵان:** تۆ بڕۆ بە لای کـاری خـۆتەوە، من نـایزانم. باوەڕبکە هیچی لێ نازانم. پاشان لەناو ئەم هەموو خەڵکە، بۆ چی هەر دەبێ من وەڵام بدەمەوە؟
**نێــرگـــز:**(ڕووەو پیـرەژن، سـەیرکە! پەلکە ڕێواسـەکـان چۆلەکەیان گرتووە بۆ کراسە جوانەکەت!
**ئـــــەردەڵان:** ( بەتـووڕەییـەوە) بەڕای من، ئیـدی چیـتـر ڕێواسـیش نەخـۆین. هیچ نەخـۆین، تا ئیـدی هەمـوومـان

پێکەوە دەمرین.
**پیرەژن:** ( لەبەر خۆیەوە) زۆر سەیرە! خۆ کەس ئاگای لە کەس نیە!
**شەیدا:** هۆیەکەی ئەوەیە کە کەس خەوی لێ ناکەوێ. هەمووشمان پەلەمانە.
**پیرەژن:** ( لەبەر خۆیەوە) لە هەمووی سەیرتر ئەوەیە کە من لە کەرکووک لەدایک بوویم، کەچی ئەوان دەیانەوێ بمبەنەوە مهاباد!
**نێرگز:** (پەنجە لەسەر مێشکی پیرەژن دادەنێ) تۆ مێشکت پڕە لە خێو! لە هیچ تێ ناگەی!
**پیرەژن:** ئاخ، من زۆر کۆنم...
**ئەردەڵان:** (ڕووەو شەیدا) ئەرێ شەیدا، من ئەو وەختەی گەنج بووم مەلەوانیم دەزانی؟
**شەیدا:** ببوورە، زۆر ماندووم؛ ناتوانم وەڵامی ئەم پرسیارەت بدەمەوە.
**نێرگز:** ( ڕووەو ئەردەڵان) واز لە مەسەلەی مەلەوانی بێنە، خۆشەویستەکەم ( دەست لە ملی ئەردەڵان دەکا) من دەمێکە لەناو چاوەکانتدا کەوتوومەتە بۆقەمەلە!
**ئەردەڵان:** ( خۆی لە دەست نێرگز ڕادەپسکێنێ، ڕووەو جوامێر) وەرە، بگەڕێوە، ماڵت نەڕمێ! دەتەوێ بڕۆی؟ بەخوا بەتەنیا لەم ڕێگاوبانەدا هەر گورگ و کەمتیار دەتخۆن!
**جوامێر:** نا، واز لە من بێنن. ئەرێ ( دەگەڕێتەوە و ڕوودەکاتە نێرگز) دەتوانم نامەیەکت بدەمێ کە لەگەڵ خۆت بیگەیەنیتە دایکم لە هەولێر؟
**نێرگز:** بەسەرچاو. بەسەر گۆڕەکەیدا ڕەت دەبم و دەچڕێنمە



گوێچکە بچکۆڵانەکەی. هیچ خەمت نەبێ!
**شەیدا:** ئاخ! من کەی خەوم لێ دەکەوێ! کەی؟
**پیرەژن:** کوێراییم دایە( ڕوودەکاتە نێرگز) ئەرێ کچم، تەنیا تۆ گوێ لە من دەگری، دەمەوێ بزانم بۆچی دەتانەوێ بمبەنەوە مهاباد؟
**نێرگز:** لەبەرئەوەی شوێنی تر دوورە.
**پیرەژن:** چ شوێنێک؟
**نێرگز:** هەموو شوێنێک.
**پیرەژن:** هەموو شوێنێک دوورە؟
**نێرگز:** هەموو شوێنێک ، یەکجار دوورە، یەکجار دوورە!
**پیرەژن:** کوێ لە هەموو شوێنێک نێزیکترە؟
**نێرگز:** ئێرە.
**لاڵە:**(هەنسک و گریانی لاڵە وردە وردە بەرزتر دەبێتەوە).

(ماوەیەک بێدەنگی، تەنیا نووزانەوەی لاڵە دەبیسترێت).

**نێرگز:** ئەرێ قسەیەک بکەن، ئەم بێدەنگییە چیە؟
**پیرەژن:** ( بە ئازارەوە سەر بەرزدەکاتەوە و هەناسەی حەسرەت هەڵدەکێشێ).
**ئەردەڵان:** ئێوە هیچ لە خۆتان پرسیوە « ئێمە بۆچی لەم سێکوانەدا کەوتووین؟» .
(کەس وەڵام ناداتەوە)
**ئەردەڵان:** ( لەبەر خۆیەوە) لەوەتەی لێرەین، هەر بە دەوری یەکتر دەخوولێینەوە. خەریکە لە تاوان ڕۆحی یەکتر دەکرۆژین. ڕۆشناییەکان دوورن، مرۆڤەکانیش ماندوو.

(ڕوو دەکاتە شەیدا) ئەوە چیە؟ دە هەر هیچ نەبێ «تۆ» وەڵام بدەرەوە!
**شەیدا:** پیاوێکی بەدبەخت و کەری وەک تۆ، کە لەم سێکوانەدا کەوتووی، من بەلامەوە سەیرە، چۆن جورئەت دەکەی ئەم جۆرە پرسیارانە لە من بکەی؟
**جوامێر:** من هەر ئەوەندە دەزانم کە ئێمە ناتوانین هەر لێرەدا ڕەگ داکوتین. دەبێ ئەم سەر سێ سنوورە بەجێ بێڵین!
**پیرەژن:** ( ڕووەو نێرگز) ئێمە ئێستا لە کوێین، کچم؟
**نێرگز:** من نازانم.
**پیرەژن:** با، تازە گوێم لێ بوو وتت کە لە شوێنێکداین.
**نێرگز:** منیش لە جوامێرم بیست.
**جوامێر:** چیت لە من بیست؟
**نێرگز:** وتت کە ئێمە لە سێکوانێکداین.
**جوامێر:** درۆ بە ناوی منەوە مەکە، تکایە!
**شەیدا:** ڕاست دەکا، جوامێر نەبوو. لە سەرەتادا پۆلیسەکە بوو ئەمەی گوت.
**پیرەژن:** گوتی چی؟
**شەیدا:** گوتی کە ئێمە لە سێکوانێکداین، لەسەر سێ سنوور.
**جوامێر:** لەسەر سێ سنوور.
**پیرەژن:** لەسەر سێ سنوور؟
**جوامێر:** بەڵێ، لەسەر سێ سنوور.
**شەیدا:** ئەگەر پۆلیسەکە وای پێ نەگوتینایە، دەمردین و نەشماندەزانی لە کوێین!
**نێرگز:** ئنجا ئەمە شتێکی گرنگە؟



**جوامێر:** چی؟
**نێرگز:** لە کوێ بین و لە کوێ نەبین؟
**جوامێر:** زۆر.. زۆر گرنگە! تراژیدیای ئێمە مەسەلەی شوێنە! خراپ هەڵکەوتووین.
**ئەردەڵان:** کەواتە باشترین شت ئەوەیە ئێمە لە کوێ بین؟
**جوامێر:** من بە تەواوەتی نازانم.
**شەیدا:** بێهوودەیە.
**ئەردەڵان:** چی بێهوودەیە؟
**شەیدا:** بێهوودەیە بیر لەم پرسیارە بکەینەوە.
**ئەردەڵان:** بۆ؟
**شەیدا:** چونکە ئەگەر بشمانەوێ شوێنێک هەڵبژێرین، لەوێش دەرمان دەکەن.
**جوامێر:** تەنیا یەک شت هەیە کە زۆر ڕوون و ئاشکرایە.
**ئەردەڵان:** چیە؟
**جوامێر:** ئێمە هەرگیز ناتوانین کە هەموومان پێکەوە لە یەک شوێندا بین.
**نێرگز:** کەواتە؟
**جوامێر:** چارەسەر تەنیا ئەوەیە کە هەر یەکەمان بۆ خۆی لە شوێنێک بێ.
**ئەردەڵان:** ئەمە ئاسانە.
**پیرەژن:** ئەی بۆ وا نەکەین؟
**شەیدا:** چونکە غەریبیی یەکتر دەکەین.
**ئەردەڵان:** ڕاستە، ناتوانین. ناتوانین کە هەر یەکەمان بە جیا لە شوێنێک بژین.
**جوامێر:** هەر چۆنێک بێ، گرنگ ئەوەیە کە لەسەر ئەم سێ سنوورەدا نەمێنینەوە!

**نێرگز:** ئەی ڕوو بکەینە کوێ؟

**هاوڕێ:** با چاوەڕێی پۆلیسەکە بکەین!

**شەیدا:** نەخێر.

**پیرەژن:** ( دەلاڵێتەوە) تکاتان لێ دەکەم، بڕۆن، بەجێم بێڵن ( دەگری) قەیناکە، بەجێم بێڵن. بڕۆن!

**جوامێر:** ( ڕووەو ئەردەڵان) من داوای لێبوردن دەکەم ئەگەر بەم قسەیەی پێشوو دڵم ئێشاندبن. جگە لەوەش، ویستم ئەوەتان پێ بڵێم کە من دەتوانم هەموو ئەو شتانە جێبەجێ بکەم کە ئێوە پێمی ڕادەسپێرن. بەمە رازین؟

**ئەردەڵان:** بڵێم چی؟ نازانم!

**جوامێر:** دەمەوێ بزانم، ڕازین یان نا؟ یەک قسە!

**ئەردەڵان:** ناکرێ! (پیاسە دەکات و لەبەر خۆیەوە) ئەم دەعبا پیسە لە بەرۆکمان نابێتەوە. دەڵێی زەرووە بە لەشمانەوە نووساوە.

**نێرگز:** نەخێر وا مەڵێ! ئم پیرەژنە بەشێکە لە ئێمە، لێمان جیا نابێتەوە.

**جوامێر:** تۆ بۆچی هێندە لەسەر ئەم مەسەلەیە سووری، خانم؟

**نێرگز:** لەبەرئەوەی شێوەی هیچ بولبولێک لە خەیاڵمدا نەماوەو ناشتوانم لێرە بەشێوەیەکی ئازاد ڕای خۆم دەرببڕم.

**جوامێر:** کەواتە ئێمە هەتا هەتایە هیچ شوێنێکمان نابێ کە تێیدا بحەسێینەوە!

**شەیدا:** گوێ هەڵدێرن! گوێ هەڵدێرن لە دەنگی چیا، لە دەنگە خۆشە وەریوەکان! من خەریکە لە زەوی دەبمەوە. ئاه! ئەندێشە چۆن سەما دەکا!

**نێرگز:** ڕاست دەکا، دەنگی مردووەکانە دێ، دەنگی



لاشەی ئەو منداڵانەی کە لێرەدا چاندمان، دەنگی لاشەی ئەو پەنجەرانەی کە لەم ناوەدا ناشتنمان! ( ڕووەو پیرەژن) داپیرە گیان، ئێوە لە زەمانی کچێنیی خۆتاندا منداڵتان دەچاند؟

**شەیدا:** تکایە، کە مردم منیش هەر لەم ناوە بچێنن. من دەمەوێ سەوز ببم، بڕوێمەوە.

**ئەردەڵان:** ( ڕووەو جوامێر) باشە تۆ نەتگوت « دەڕۆم» بۆچی گەڕایتەوە؟

**جوامێر:** ببوورە، وتت چی؟

**ئەردەڵان:** تۆ نەتگوت « دەڕۆم» ؟ بۆچی گەڕایتەوە؟

**جوامێر:** من؟ ( ڕوودەکاتە نێرگز) ئەرێ من وتم «دەڕۆم» ؟

**نێرگز:** ببوورە؛ من ماوەیەکە ناتوانم باش بۆن بکەم.

**ئەردەڵان:** ئێستا کاتژمێر حەوت و نیوە. دەمێکی دیکە خۆر بە تەواوەتی ئاوا دەبێ، ئنجا ئەوکاتە بزانە چاوی گورگ و کەمتیارەکان چۆن بەو شاخەوە سوور دەچنەوە! وەرە دانیشە، وەرە! با دیسان پەژیوان نەبیتەوە!

**جوامێر:** نەء ، من سوورم لەسەر ڕۆیشتنی خۆم.

**شەیدا:** هەنگاوەکان نە سەرەتایان هەیە و نە کۆتایی، هەمووشیان لەناو ئێمەدان. گوێت لە دەنگی هەنگاوە دوورەکانە، چۆن بەدەم گریانەوە گۆرانیی پەشیمانی دەڵێنەوە؟

**پیرەژن:** ( لەبەر خۆیەوە) من چاوم کەم حوکم بووە. نابینم! نابینم!

**ئەردەڵان:** (پێدەکەنێ) هی هی هی هی! بەخوا کەڵڵۆسیش ناخۆشە!

**شەیدا:** ئاخ، ئەفسووس! من کەی خەوم لێ دەکەوێ!
**پیـرەژن:** (دەپارێتەوە) تکاتان لێدەکەم، لەناو ئەم شاخ و داخانەدا بەجێم بێڵن، قەیناکە، بڕۆن! بەجێم بێڵن!
**جـوامـێـر:** ( هەڵدەسـتـێـتـەوە) من دەبێ بڕۆم. داوای لێبوردنتان لێ دەکەم.
**نێـرگـز:** زۆر سـوپاس. خـوات لەگـەڵ. هەوڵ دەدەم لە خەونەکانمدا ڕاسپێریەکەت بگەیەنم.
**جوامێر:** ( لەناکاو لە نزیک پیرەژنەکە دادەنیشێتەوە، کەپۆڵی لەناو دەستەکانی خۆیدا دەگرێ؛ بیردەکاتەوە)
(ماوەیەک بێدەنگی)

**پیرەژن:** ئەرێ ئەو بۆنە ناخۆشە چیە لەم ناوە دێ؟
**جوامێر:** ( بەتووڕەییەوە ڕووەوە پیرەژن) تۆ بۆچی لێمان ناگەڕێی کەمێک بە هێمنی بیر بکەینەوە؟
**نێرگز:** تۆ یەکجار زۆر حەزت لە منگە منگی بێ واتایە، پیرەژن!
**ئەردەڵان:** لەم سێکوانەدا پیربووین هێندەی بۆنی غەریبیی یەکتر بکەین.
**جوامێر:** بۆنی زەبوونیـی خۆمان.
**شەیدا:** بۆنی برینی ئاوارەییمان.
**نێرگز:** بۆنی دەردی بێ وڵاتیمان.

**پاریس: ١٩٩١/٦/١**

*** لە گۆڤاری (کاروان)دا بلاوکراوەتەوە.**



# حەشیشەکێشەکان



کەسەکان:

**هیوا:** تەمەنی سی و سێ ساڵە، کراسێکی سپیی قۆڵ درێژی لەبەرە، سەرو قژی: خۆڵەمێشی، شێواو.

**سیروان:** تەمەنی سی ساڵە، جلوبەرگی ماڵەوەی (بێجامەی) لەبەرە. لەش سووک و گورج و گۆڵ.

**بارام:** تەمەنی سی ساڵێک دەبێ، ناوەڕاستی سەری رووتاوەتەوە، ریشی کەمێک هاتووە (نەتاشراوە). ماندوو دیارە.

**رزگار:** تەمەنی سی و سێ ساڵە، لە هەمووویان باڵا بەرزترە. ئادگارێکی شێلگیرانەی هەیە.

**فەرەیدوون:** (دەرناکەوێ، تەنیا دەنگی دەبیستین).

**دیمەن**

سالۆنێکی گەورەی شپرێو لە ئاپارتمانێکی شاری پاریسدا. مێزێکی گەورەی بازنەیی لە ناوەڕاستی چوار کورسیدا دانراوە؛ چەند بوتڵە شەرابێک، چوار پەرداخ، پاکەت و جگەرە، هەروەها یەک ـ دوو پرتەقاڵ و سێوی لەسەر دانراوە. کورسییەکان، کورسیی چەرمینی گرانبەهان، بەڵام شڕو کۆن: هەر یەکەی ڕەنگێک .

لەناوەڕاستی سالۆنەکەدا، لەژێر پێی کورسییەکاندا، لەم لاو لەولا، چەند بوتڵە شەرابێکی بۆش و چەند کتێبێک، هەروەها هەندێ پەڕۆ و پاتاڵ کەوتوون؛ لەگەڵ سینییەکی مسین کە چاپەستێک و چەند پیاڵەیەکی لەسەر داندراوە.

لەدەستە ڕاستی شانۆدا، دەرگای ژوورێک لا و نیو دیارە: ژووری (فەرەیدوون). لەدەستە چەپیشدا دوو دەرگای دوو ژووری دیکە دیارن. لەبەرامبەردا، بەدەستە ڕاست،

پەنجەرەیەکی گەورە دیارە: داخراوە، پەردەیەکی تەنکی ڕەنگینی پێدا دراوە. بە دەستە چەپیشەوە، نەخشەیەکی کوردستانی گەورە، بەلارەوە بوویی، لای ڕاستی بەرداوە و شۆڕبۆتەوە .
لەلای دەستە ڕاستدا، لەپێشەوە، سەرانگوێلکێک لەتەنیشت دیوار داندراوە: هەندێ لاپەڕە و پەلکە مۆز و پەلکە پرتەقاڵی لەژێر کەوتووە. سیروان و هیوا و بارام دانیشتوون. ڕۆشنایی ناو ساڵۆنەکە کزە، ڕووناکی تەنیا لە ناوەڕاستە: لەسەر مێزەکە و دەوروبەری.



**سیروان:** (گوێی بۆ ژوورەکەی دەستەڕاست هەڵخستووە) دەنگی نەما، ئاگاتان لێیە ؟!
**هیوا:** لەوانەیە ئێستا پاڵ کەوتبێ، بیر بکاتەوە .
**سیروان:** نەء ، خەوتووە . ئەرێ بەڕاست؛ شێت بیر دەکەنەوە ؟
(کەس وەڵامی ناداتەوە. ماوەیەک بێدەنگی)
**سیروان:** (ڕووە و بارام) بارام، تۆ هەر بەجارێک دەمت چۆتە گرێژنەوە. دە قسەیەک بکە !
**بارام:** ئێمە، نازانم بۆچی؛ بۆچی ناتوانین هەر یەکەمان بۆ خۆمان بژین ؟
**هیوا:** چونکە ڕووتاوەتەوە و هیچ شتێک ناگرێ .
**بارام:** چۆن ؟
**هیوا:** درێژەی مەدەرێ. چارەی ترمان نییە، باشتر وایە لەناو بچێت و بۆ خۆی لە کۆڵ ئەم سەمەرگییەی ئێستای ببێتەوە .
**بارام:** سەرنجم داوە کە تۆش ماوەیەکی زۆرە کەوتویتەتە وڕێنە کردن. هەر بزانە چەند ڕۆژێکی دیکە تۆش ئەقڵی خۆتت لەدەست دا و شێت بووی.
**هیوا:** من کۆنفۆرمیستی تازەم (دووکەڵی جگەرە بەبا دەکا).
**سیروان:** (ڕوودەکاتە بارام) من لەم مەسەلەیەدا هاوڕاتم؛ ئێمە ئەگەر بمانتوانیایە بیر لە یەکتر نەکەینەوە، ژیانمان لەوانەیە کەمێک هێمنتر ببوایە.

**(ماوەیەک بێدەنگی)**

**بارام:** من پێویستم بە سەفەرێکی درێژ هەیە، بەڕاستی. (بوتڵێکی بۆشی بەدەستەوەیە؛ غەمگین، نائاراماتە، جار جار

له قاچی ئەسکەملیەکەی ژێر خۆی دەدا).

**هیوا:** منیش پێویستە لەو ژنە نەزۆکەم جودا ببمەوە و پاشانیش خۆم بکوژم.

**بارام:** (دەنگی بوتڵە بۆشەکە: تەق، تەق، تەق) ژیان ئێمەی لەبیر کردووە.

**سیروان:** منیش، ئەوەتا: تەمەنم سی ساڵە، کەچی هێشتا هیچ پەساپۆرتێکم نیە! هیچ جنسیەیەک!

**بارام:** هەموو بەیانییەک دەچینە سەر کار، ئێوارە لەسەر شەقامێک تووشی هاوڕێیەکی ئاوارەی بەدبەختی وەک خۆمان دێین، دادەنیشین قاوەیەکی لەگەڵ دەخۆینەوە، یان پێکەوە دەچینە باڕێک. نیوەشەوانیش دەگەڕێینەوە ژوورە بچکۆلەکەمان. ئیدی بەم شێوەیە، ژیان بەسەر دەچێت و وردە وردە سەروقژمان سپی دەکا، ددانەکانمان هەڵدەوەرێنێ، خەون و بیر و بیرەوەرییەکانمان ڕەش دەکاتەوە.

**سیروان:** کەواتە ئێمەی لەبیر نەکردووە .

**بارام:** کێ ؟

**سیروان:** ژیان.

**بارام:** با.

**سیروان:** تۆ چاوت زۆر تیژە، بەڕاستی!

**بارام:** بەڵام هەستی بیر کردنەوەم زۆر لاواز بووە.

**سیروان:** تۆ قەت بیرت لەوە نەکردۆتەوە ژنێک بهێنی، بارام ؟

**بارام:** نەء .

**سیروان:** بۆ ؟

**بارام:** چونکە ئەم مەسەلەیە زۆر دووبارە بۆتەوە.

**سیروان:** تۆ لێت بۆتە خوو؛ هەمیشە بەم قسەیە وەڵامی



ئەم پرسیارەی من دەدەیتەوە.

**بارام:** تۆش لێت بۆتە نەخۆشی؛ سەدان جارە ئەم پرسیارە لەمن دەکەی.

**سیروان:** من زۆر حەز لەپرسیاری کۆن دەکەم.

**بارام:** (تەماشای هیوا دەکات) ئەوە نیە هیوا ژنێکی فەڕەنسی هێناوە و منداڵیان نابێ !

**هیوا:** (لەبەر خۆیەوە، وەک ئەوەی خەونێکی خۆش ببینێ، بەدەم زەردەخەنەوە) خۆش بوو! دوێنێ شەو خەونم بەدایکێکەوە بینی!

**بارام:** توخوا ئەگەر ناخۆشە، بۆمانی مەگێڕەوە.

**سیروان:** (لەناکاو گوێ بۆ ژوورەکەی فەرەیدوون هەڵدەخا) شش!!

**هیوا:** چیە؟

(لەژوورەکەی فەرەیدوونەوە دەنگی کۆخە کۆخێکی توند دێت).

**سیروان:** گوێتان لێیەتی ؟ دەکۆخێ !

**بارام:** هەر بزانە دیسانەوە گووی کرد.

**هیوا:** هەر دەمێکی دیکەیە و تەواو، ئیتر بۆخۆی بەیەکجاری گیانی شاد دەبێت و ..دەبڕێتەوە.

**سیروان:** چیتر وەک ئێمە بەدەست بێ وڵاتی و ناخۆشییەکانی ژیان ناتلێتەوە.

**بارام:** تۆش حەشیشەت لەلا نەماوە، سیروان ؟

**هیوا:** دە ئەمشەو تۆ مەیکێشە، بارام !

**بارام:** من ناتوانم بێ حەشیشە ئەم کارە بکەم.

**هیوا:** کام کار ؟

**بارام:** کوشتنی فەرەیدوون.

**هیوا:** ئەمە کوشتن نییە، بارام ! ئێمە نایکوژین.
**بارام:** ئەدی ناتانەوێ بیخنکێنن ؟
**هیوا:** دەمانەوێ بۆ خۆی بحەسێتەوە.
**بارام:** واتان دانەناوە کە دەمێکی تر، وەختێ رزگاریش دێتەوە، پێکەوە بچن لەگەرمەی خەوی شیریندا دەست بنێنە قوڕگیەوە و بیخنکێنن ؟
**هیوا:** نەء .
**بارام:** ئەدی ؟
**هیوا:** ئێمە تەنیا یارمەتیی دەدەین.
**بارام:** لەچی ؟
**هیوا:** لەوەی کە بتوانێ خۆی ـ خۆی بخنکێنێ.
**بارام:** پاشانیش کە دنیا تەواو تاریک دادێ، دەچن لەناو باخچەکەدا بەدزییەوە گۆڕێکی بۆ هەڵ دەکەنن و دەینێژن، وانیە؟
**هیوا:** ئێمە، هەر ئەوەندەیە: کاتێ ئەو چنگ دەنێتە قوڕگی خۆیەوە، ئەم جارەیان ناچین وەکو جاران ڕێی لێ بگرین: لێی دەگەڕێین تاکو خۆی ـ خۆی دەخنکێنێ.
**بارام:** ئەی ئەمە کوشتن نیە ؟
**هیوا:** نەء .
**بارام:** ئەی چیە؟
**هیوا:** ئەگەر بچی قورساییەکانی سەر باڵی پەپوولە بخوێنیتەوە، باش تێ دەگەی.
**سیروان:** هەمووومان لەسەری ڕێک کەوتووین، بارام گیان چارەسەری دیکە نییە.
**بارام:** وەکو (مفاوەزات).
**سیروان:** ئەمە تاقە ڕێگایەکە بۆ ئەوەی بتوانین ژیانی ئەم



برادەرە خۆشەویستەمان لەم زەبوونی و سەرەمەرگییەی خۆی رزگار بکەین.
**هیوا:** (پەنجە لەسەر کاژەڵاکی خۆی دادەنێ و ڕوو دەکاتە بارام) تۆ هیندە لەناو سەندەویچخانە و پیاز و پەتاتەدا ژیاوی، مێشکت قەڵب بووە.
(ماوەیەک بێ دەنگی. شەراب تێ دەکەن و دەخۆنەوە)
**سیروان:** ئاخ ! فەرەنسییەکان، تەنانەت سەگەکانیشیان پەساپۆرتیان هەیە؛ کەچی من تەمەنم سی ساڵە، وەرە هیچ پەساپۆرتێکت نەبێ !
**بارام:** دامناوە بەیەکجاری واز لە سەندەویچخانەکە بێنم.
**هیوا:** سەندەویچخانە، چ سەندەویچخانە! دەڵێی قوونە سەگە!
**بارام:** یازدە ساڵە هەمان پرسیار و هەمان وەڵام.
**هیوا:** هەر هیچ نەبێ شاگردێکی لەسەر دانێ !
**سیروان:** ئەرێ ڕاست دەکا، بارام ؛ تۆ چۆن پێت دەکرێ سەندەویچخانەشت هەبێ و سیاسەتیش بکەی ؟
**بارام:** ئەم ماوەیە سیاسەتیش و سەندەویچخانەشم... هەموو شتێکم بەتەواوەتی لەپێش چاو کەوت. زۆر بێزارم، سیروان گیان.
**هیوا:** تۆ بەتەنیا نیت ڕۆحی شیرینم. میللەتێک، میللەتێک تێکڕا ! سەیری فەرەیدوون بکە: ژیانی خۆیشی لەگەڵ لەدەست دا !
**بارام:** ئێ خۆ منیش ئەگەر یەک تۆزقاڵ شەرەف و کەرامەتم هەبووایە، هەر لەگەڵ هەواڵەکە یەکسەر وەکو ئەو شێت دەبووم.
**سیروان:** خەسرەو لە تەلەفۆن دەیگوت (خوشکم یازدە

مندالی هەبوو، هەر هەموویان پێکەوە، لەگەڵ خوشک و زاواکەشم، بوونەتە خۆراکی بۆمبابارانەکەی سلێمانی).

**(بێدەنگی)**

**هیوا:** ئێمە، هەر دەبووایە یەکێکمان شێت بین.

**بارام:** بۆ ؟

**سیروان:** ڕاست دەکا.

**هیوا:** شێت بوونی ئەو پەیوەندیی بەڕۆحی هەمووومانەوە هەیە.

**بارام:** مەبەستت ژیانی زەبوونانەی دووره وڵاتیمانە ؟

**هیوا:** شتی تریش.

**سیروان:** ئینجا خۆ ئەو لە شیعرەکانیشیدا، ئەو داڕووخانە ڕۆحییەی ئێمەی لە دووره وڵاتیدا زۆر جوان دەربڕیبوو.

**هیوا:** ئا، بەڵام ئەو بەم شێت بوونەی خۆی، هەقیقەتێکی تەڵخی دیکەشی بە چاومان دادایەوە .

**بارام:** هەقیقەتی چی ؟

**هیوا:** هەقیقەتی ئەوەی کە ژیان، بەڕاستی، هیچ مانایەکی نیە.

**بارام:** ئەی چ شتێک مانای هەیە ؟

**هیوا:** تەنیا شیعر، هونەر، جوانی !

**بارام:** هیوا، تۆ بەدزییەوە جارجار دەچیتە مووبەقەکە و حەشیشە دەکێشی، دەزانم. کوڕی چاکبە و جگەرەیەکم بدەرێ!

**هیوا:** (مژ لە جگەرەکەی دەدا) چاوەڕێ بکە، رزگار بێتەوە لەگەڵ خۆی دەیهێنێ.(جگەرەکە دەداتە بارام) هانێ تەنیا مژێک !

**سیروان:** (ڕوو دەکاتە هیوا) ئەرێ بەڕاست، تۆ خەونەکەی



خۆتت بۆمان نەگێڕایەوە ؟

**بارام:** نا، تکایە، ئەمشەو هەر چوارمان نزیکترین برادەری خۆمان دەکوژین. تکایە ئەمشەو باسی خەون مەکەن ! من دەترسم.

**هیوا:** (ڕووەو بارام) پەیوەندیی بەدایکەوە هەیە.

**بارام:** دایکی خۆت ؟

**هیوا:** نەء ، دایکی تۆ.

**بارام:** نا، بەڕاستی، دایکی کێ ؟

**هیوا:** نا، بەڕاستی، دایکی ئەو.

**سیروان:** دایکی فەرەیدوون ؟

**هیوا:** دایکی هەموومان.

**سیروان:** ئنجا خۆ تۆ دایکی منت نەبینیبوو ؟

**هیوا:** بەڵام لەگەڵ ئەوەش...

**سیروان:** لەگەڵ ئەوەش، چی .؟

**هیوا:** خۆ مهابادم دیوە !

**سیروان:** ئێ !

**هیوا:** قابیلە ڕۆژێک دایکی تۆش ـ بەڕەحمەت بێ ـ بەهەمان ئەو شەقامەدا تێپەڕ نەبووبێ کە من هەموو ڕۆژێک پێیدا تێدەپەڕیم ؟!

**بارام:** تۆ چ ساڵێک لە مهاباد بووی، هیوا ؟

**هیوا:** ئەو ساڵەی کە هەفتە هیچ ڕۆژێکی تێدا نەمابوو، هەموو خەڵک بەدووای ڕۆژێکدا دەگەڕان کە هەفتەکانی خۆیانی تێدا بشارنەوە.

**سیروان:** سێ ساڵ پێش ئێستا، ئەو کاتەی لە (ژنێڤ) بووم، هەمیشە بەتەنیا دەژیام؛ یەکجار زۆر بیرم لە دایکم دەکردەوە؛ لەوێ خەریک بوو منیش وەک فەرەیدوون ئەقڵم

تێک بچێ و شێت ببم. دەزانن !

**هیوا:** جا خۆ فەرەیدوون لەبەرئەوە شێت نەبووە کە زۆر بیری لە دایکی دەکردەوە !

**سیروان:** دەزانم.

**بارام:** فەرەیدوون زیاتر بیری لە دەزگیرانەکەی دەکردەوە.

**هیوا:** فەرەیدوون دەیویست کە هێڵەکان ئازاد بژین.

**سیروان:** فەرەیدوون بیری لە لەناو چوونی ڕەنگەکان دەکردەوە.

**بارام:** تۆ ئەو وەختەی لە (ژنێڤ) بووی، حەشیشەت دەکێشا، سیروان ؟

**سیروان:** ئا، بەڵام ئەو کاتە وەکو ئێستا بێ پارە و پووڵ و بێ کار نەبووم.

**هیوا:** درۆ دەکەی.

**سیروان:** نەخێر.

**هیوا:** تۆ، لەوەتەی دەتناسم، هەر وەکو من بووی؛ ماڵت: ئازار، ڕێگاکانیشت: کۆمەڵێک خەون و بیرەوەری.

**سیروان:** من ئێستا هەر بەتەواوەتی هەقی خۆمە خۆم بکوژم.

**بارام:** بۆ ؟

**سیروان:** تەمەنم سی ساڵە، ـ کوڕی باش؛ سی ساڵ، کەچی هیچ پەساپۆرتێکم نییە ! هیچ جنسیەیەک !

**بارام:** (ڕوو دەکاتە هیوا) ئەرێ بەڕاست، هیوا، تۆش ئەو وەختەی لە (کۆبنهاگن) دەژیای، جارێکیان ویستبووت خۆت فڕێ بدەیتە بەحری بەڵتیکەوە، بۆچی ؟

**هیوا:** لەبەرئەوەی دانیمارک، بە درێژایی ئەو دوو ساڵەی کە لەوێ ژیام، لە پارچە پەنیرێکی بۆگەن زیاتر هیچی تر



نەبوو.

**سیروان:** ئەوەیە ئیتر، دوورە وڵاتی: سەرتاپای دەرد و بەدبەختییەکانە لەیەک کاتدا.

**رزگار:** (لەدەستە ڕاستەوە لەناکاو بەهەڵپە دێتە ژوورەوە. کۆمەڵێک لاپەڕەی چاپکراوی لە بەرگێکی ڕەنگیندا ـ لەشێوەی کتێبێک ـ پێیە، دایدەنێتە سەر مێزەکەی ناوەڕاست) لە هەموویشی قۆڕتر: بێ پارەیی... بێ پارەیی !

**بارام:** (ڕووەو رزگار) لەگەڵ (ئیزابێل) چیت کردەوە ؟

**هیوا:** هیچ پارەی دا ؟

**رزگار:** هەزار فرەنک.

**سیروان:** دەبینی ! کچە فەڕەنسییەکی شیعردۆست ! دەوڵەمەندی کوردی واش هەیە، خانووی خۆی و چێشتخانەیەکیشی لە پاریس هەیە، کەچی پێی چاوە تەنانەت بە سەد فرەنکی حیزیش هاوکاریمان بکات !

**رزگار:** بێگومان! (بە تووڕەییەوە) دەزانی هۆیەکەی چیە؟ چونکە ئەو دەبەنگە پارەپەرستانە، نەدەتوانن لە شێت بوونی فەرەیدوون تێ بگەن، نەدەشزانن شیعر چیە !

**هیوا:** نەخێر، هۆیەکەی ئەوە نیە ! دەنگت زۆر بەرزە، رزگار.

**رزگار:** (بەدەنگی نزم) ئەی هۆیەکەی چیە ؟

**هیوا:** هۆیەکەی ئەوەیە کە ئێمەی کورد هیچ یەکێکمان تاکو ئێستا لە داستانی سەلۆمۆن تێنەگیشتووین.

**سیروان:** ئاو هەمیشە تەنیایە ! هەمیشە ! فەرەیدوون خۆیشی هەر وای دەگوت.

**هیوا:** لە کوردستانیش.

**سیروان:** بێگومان، لە کوردستانیش.

**رزگار:** ئەو کوردە خاوەن پارانەی پاریس، ئەگەر یەک تۆزقاڵ چێژ و توانای ئەوەیان هەبووایە کە لە شیعرەکانی فەرەیدوون تێ بگەن، ئەوا چێشتخانەکەی خۆیان دەفرۆشت و ئەم دیوانە شیعرەی ئەویان پێ چاپ دەکرد. بەڵام بەداخەوە، بەداخەوە !

**هیوا:** (وەک ئەوەی خەونێک ببینێ) لەسەر شەقامێکدا، لەگەڵ کۆمەڵێک خەڵک، بێدەنگ، بەدووای مەیتێکەوە دەڕۆیشتین.

**بارام:** بەرەو کوێ دەچوون ؟

**هیوا:** وا بزانم بەرەو گۆڕستان دەچووین.

**رزگار:** کەی ؟

**سیروان:** خەونەکەی خۆی دەگێڕێتەوە.

**هیوا:** لەنێو ئەو هەمو خەڵکەدا، من تەنیا دایکێکم دەدیت. وابزانم دایکی فەرەیدوون بوو، بەتەنیا لەپێش دەرگایەک ڕاوەستابوو.

**سیروان:** چی دەگووت ؟

**هیوا:** دەگریا. دەپاڕایەوە، دەیگوت : (من تەرمی کوڕەکەم سپاردە دەستی ئێوە، تکایە لەم دوورەوڵاتیەدا لە گۆڕستان مەینێژن؛ ببەن لەباخچەیەکدا بینێژن !).

**سیروان:** وتی لە باخچەیەکدا بینێژن ؟

**هیوا:** ئا.

**رزگار:** پێت نەگوت کە ئێستا هەموومان پارەمان کۆکردۆتەوە و دەمانەوێ دیوانە شیعرەکەی چاپ بکەین ؟

**هیوا:** با پێم گوت، وتم: (ئێستا هەموومان پارەمان کۆکردۆتەوە و دەمانەوێ دیوانە شیعرەکەی چاپ بکەین).

**سیروان:** ئەرێ بەڕاست، بارام ، خۆ تۆش ـ لەبەر ئەوەی



سیاسەتت کردووە و پیاوێکی سیاسەتمەداریت ـ ئەگەر بمری، خۆ ناتوانین تەرمەکەت بنێرینەوە بۆ کوردستان ؟!

**بارام:** ئێ ؟!

**سیروان:** ئەگەر بمری، حەز دەکەی لەکوێ بتنێژین ؟!

**بارام:** من مستەهەقی زبڵخانەش نیم.

**هیوا:** منیش .

**سیروان:** من خۆیشم.

**رزگار:** کەسمان.

**هیوا:** ڕووبارەکان لەوێ لەبرسان دەگرین و ئێمەش لێرە...

**سیروان:** بەفرە ئاوارەکان لەوێ دەسووتێن و ئێمەش لێرە...

**بارام:** تا ئێستا چەند پارەمان کۆکردۆتەوە؟ گەییوەتە چەند؟

**رزگار:** پێویستیمان بە هیچی تر نییە.

**هیوا:** بەیەکتریش ؟

**سیروان:** با. چۆن !

**رزگار:** دەتوانین هەر سبەینێ ببەینە چاپخانە. بە چاپێکی ئۆفسێتی ڕەنگاوڕەنگ ڕایدەکێشین.

**سیروان:** سبەینێ هەموومان پێکەوە دەچینە چاپخانە.

**هیوا:** سبەینێ هەموومان پێکەوە دەچینە چاپخانە.

(لە ژوورەکەی دەستە ڕاستەوە دەنگی فەرەیدوون دێ: بە دەنگی بەرز دەناڵێنێ و هەموویان قرقەپ دەکات. سیروان بەپەلە دەچێ لە لاونیوی دەرگاوە تەماشای ژوورەوە دەکات. پاشان دەگەڕێتەوە، هێمای ئارامی و دڵنیایی دەداتە هاوڕێکانی: هیچ نیە) .

**سیروان:** (ڕووەو ڕزگار) ئەم پاش نیوەڕۆیە، تۆ لێرە نەبووی، دیسانەوە خوو گرتییەوە.

**رزگـار:** تەواو، ئەمشەو دووایین ئازاریەتی، دووایین فێ ؛ بۆ خۆی ڕزگاری دەبێت و دەحەسێتەوە.

**سیروان:** چاوەڕێ دەکەین.

**بارام:** چاوەڕێی کێ ؟

**سیروان:** چاوەڕێی ئەوەی کە ئەمجارەش دیسانەوە چنگ بنێتە قوڕگی خۆیەوە و خۆی خۆی بخنکێنێ.

**بارام:** جگەرەیەکی حەشیشەم بدەرێ، ڕزگار !

**سیروان:** (ڕووەو ڕزگار) ئەم پاش نیوەڕۆیە، لە هەموو جارێکی دیکەی کوشندەتر بوو. هەر دوو چنگی، دیسانەوە، لە قوڕگی خۆی گیر کردبوو؛ دەمی کەفێکی شینی لێ دادەچۆڕا. من و هیوا بە هەردووکمان دەمانگرت، دەرەقەتی نەدەهاتین کە چنگەکانی لە گەرووی بکەینەوە.

**بارام:** ئەدی بۆچی هەر ئەوسات لێی نەگەڕان ؟

**سیروان:** ڕزگار حەزی دەکرد کە جارێکی دیکە بیبینێتەوە.

**هیوا:** ئەوەیە ئیتر؛ نەسلێک دەمرێ بۆئەوەی کتێبێک لەدایک ببێت !

**بارام:** (بێز دەکاتەوە) ئەو گووەی زۆر ناخۆشە، گوو !

**رزگار:** دیسان ئەمڕۆش گووی لە بنە خۆی کردبوو ؟

**سیروان:** ئاگامان لێ نەبوو، پێشتر ڕشابۆوەش. کە گەیشتینە سەری، مێش و مەگەز هەر چوار دەوریان تەنیبوو .

**بارام:** ڕێکخراوی ڕەگەزپەرستە فەرەنسییەکان ئەگەر بەمە بزانن ، دێن نەک هەر ئەو، ئێمەش دەکوژن.

**هیوا:** سەریان بە گۆڕی ئەژدادیان.

**سیروان:** ئەم ئێوارەیە، جنێوی بە تورکان دەدا.

**بارام:** چی دەگوت ؟



**سیروان:** دەیگوت « تورکیا قەحبەیەکی بەختەوەرە ».

**رزگار:** فەرەیدوون پێش ئەوەیش کە شێت ببێ، هەمیشە دەیگوت « تورکیا کلیلی سەربەخۆبوونی کوردستانە ».

**هیوا:** بەڵام تورکیا ، ئەمریکا و دەوڵەتە گەورەکانی ئەمریکای لەپشتە.

**رزگار:** ئێ خۆ عیراق، لەم جەنگەی دوواییيدا نە ئەمریکا و نە دەوڵەتە گەورەکانیشی لەپشت نەبوو؟! ئەدی بۆچی نەمانتوانی خۆمان وەک «مەسەلەی نەتەوەیەک » وەک «نیشتیمانێک » بخەینە ناو باسانەوە! ها ؟ بۆچی؟

**هیوا:** لە سەرکردەکانمان بپرسە!

**سیروان:** لەناکاو چاو بە دەوروبەری خۆیدا دەگێڕێ، پاشان ڕوو دەکاتە ژوورەکەی دەستە ڕاست) کورینە، بۆنی گوو دێ!

**رزگار:** (جگەرەکەی پەنجەی بەرزدەکاتەوە و پیشانی سیروانی دەدا ) بۆنی حەشیشەیە.

**بارام:** بۆن بۆگەنیی ڕۆحی خۆمانە.

**رزگار:** بۆنی ئاوارەییمان.

**هیوا:** بۆنی برینی وەرەمکردووی بێ وڵاتیمان.

**سیروان:** (هەڵدەستێتەوە) نەء ، بۆنی فەرەیدوونە (چەند پەرۆ و پاتاڵێک لەتەنیشت خۆی کۆدەکاتەوە و بەرەو دەستە ڕاست دەچێ) .

**بارام:** کەی لەم بۆن بۆگەنییە ڕزگارمان دەبێ!

**رزگار:** لە چی!؟

**بارام:** لەم ژیانە قۆڕە!

**هیوا:** هەرگیز.

**رزگار:** تۆ پێش ئەوەی وڵات جێ بهێڵیت و ئاوارە ببی، نەتدەزانی تووشی ڕۆژێکی وا دێیت؟

**بارام:** که له ماڵێکدا لەگەڵ شێتێک بژیم و بۆنی رشانەوە و بۆنی گوو جاڕسم بکات؟ نەخێر.

**سیروان:** (له ژوورەکەی دەستە ڕاست دێتە ناو سالۆنەکە) زۆر عەیبە !

**بارام:** چی؟

**هیوا:** (پڕ بە سنگ، بە نەشئەوە، هەوای ناو سالۆنەکە هەڵدەمژێ) بۆنی غەریبی، بۆنی بێ وڵاتی.

**سیروان:** ئەو کەسەی تۆ بە " شێت " ناوی دەبەی، هەتا دوێنێ برادەرت بوو، ـ کوڕی باش !

**بارام:** تۆ قیچکەت زۆر تەنگە، سیروان.

**سیروان:** (پەنجەرەی سالۆنەکە دەکاتەوە) دەتوانی ناوی خۆی بهێنی !

**بارام:** (بەبێزارییەوە، پەرداخی شەرابەکە هەڵدەگرێ) ناوی زۆر کەسمان وەک خۆی هێنا، سیروان گیان؛ هیچ سوودی نەبوو !

**رزگار:** راست دەکا. منیش ئەم پاش نیوەڕۆیە لە تەلەفۆن ناوی براکەمم وەک خۆی دەهێنا، هیچ سوودی نەبوو ! بەڕاستی، هیچ شتێک سوودی نەماوە.

**رزگار:** ئەرێ دەیگوت چی ؟ هەر لە دیاربەکرە ؟

**هیوا:** دەیگوت " ژمارەی پەناهەندە کوردەکان ئێستا لە ئوردووگاکان دەگاتە سێ هەزار کەس".

**بارام:** چوار سەد هەزار پەنابەر تەنیا لە سەردەشت ـ ن!

**رزگار:** (رووەو هیوا) پەساپۆرت و ناسنامە و بەڵگەنامەکانی هێشتا هەر لای پۆلیسی تورکن ؟

**هیوا:** تەنانەت بیرەوەری و خەون و یادگارەکانیشی.

**سیروان:** (پشتی لە سالۆنەکەیە، لە بەرپەنجەرە راوەستاوە و



تەماشای دەرەوە دەکات) ئەوەتا! وەرن، وەرن تەماشای بکەن! ئەمە بەرازە بەدفەساڵەکەی دراوسێمانە! گەوادەی! چاوتان لێیە ! مسیۆ " دەمخوار " ! ئەو رۆژە، فەرەیدوون چووبوو دەیویست لەگەڵ منداڵەکانی ناو باخچەکە یاری بکات، کەچی ئەو قورمساغە نەیهێشتبوو. لە باخچەکە دەری کردبوو. پاشانیش کە بینیمی، دەیگوت " ئەو شێتە پیسەی هاوڕێتان ئەم گەڕەکەی جاڕس کردووە. بۆچی نایبەنە شێتخانەیەک، لە کۆڵ خۆتان و لە کۆڵ ئێمەشی بکەنەوە ؟ ".

**رزگار:** بیبەینە شێتخانە ؟ لە پاریس ؟

**سیروان:** حەیف ! فەرەیدوون، ئەو وەختەی تێک نەچووبوو، منداڵی زۆر خۆش دەویست.

**هیوا:** تەنانەت هەر خۆیشی؛ منداڵێک بوو ـ بۆ خۆی.

**رزگار:** گیروگرفتی ئەو ئەمە بوو: منداڵێک بوو کە نەیدەتوانی گەورە ببێت !

**بارام:** فەرەیدوون زۆر غەریبیی دایکی دەکرد.

**سیروان:** غەریبیی دەزگیرانەکەی.

**رزگار:** غەریبیی ماڵ.

**هیوا:** غەریبیی بەهەشت.

**بارام:** غەریبیی " شار ". (بە بێ حەوسەڵەییەوە هەڵدەستێتە سەر پێ. لە بەردەم پەنجەرەکە دێت و دەچێ) بەڵام حەیف، نایبینینەوە ! هەرگیز نایبینینەوە !

**هیوا:** کێ ؟

**بارام:** " شار ".

**هیوا:** بەتایبەتی تۆ، بارام، لەبەرئەوەی " لادێیی " بوویت.

**بارام:** من شانازی بەوە دەکەم کە لادێیی بووم.

**سیـروان:** منیش بـە رەچەڵەک لادێییم. ئـەری بەڕاست، تۆ بە رەچەڵەک خەڵکی کوێـی، هیوا ؟

**هیـوا:** من رەچەڵەکم بۆ گـیایەک دەگەڕێتـەوە لە دەوروبەری شاری " وان ".

**رزگـار:** راستییـەکەی، ئێمـە هەموومان، کۆمـەڵێک خەڵکی لادێییـن و هەرگیز ناتوانین بگەینە شار.

**بارام:** ئەدی ئەوە نیە لە پاریسـین ؟

**رزگار:** کێ دەڵێ لە پاریسین ؟

**سیـروان:** چونکە بە مێشک هەر لەناو شاخ و داخەکانی خۆماندا دەژین.

**هیـوا:** بەڵام لەگەڵ ئەوەش، هەمـوو تەمـەنی گەنجێتیمان لەسەر سنووری وڵاتەکانی ئەورووپا بە هەدەر چوو !

**بارام:** لە رێگای نێوان پایتەختە ئەورووپییە ئاپوورەکاندا.

**سیروان:** لە رێگا فرمێسکاوییە غەریبەکاندا.

**رزگـار:** هەمیـشـەش، ئێوارە بریندارەکانی رابردوو لەسـەر شانمان.

**هیـوا:** (کتێبێک، کـە لەشێوەی چەند لاپەڕەیەکی بەرگ تێگیـراودایە، لەسـەر مـێزەکـە بـە دەسـتـەوە دەگـرێ. لەسـەر کورسـییـەکەی خـۆی دادەنیـشێـتـەوە. لاپەڕەکـانی کتێبـەکـە هەڵدەداتەوە).

**بارام:** ئەمە دیوانە شیعرەکەی فەرەیدوونە ؟

**هیوا:** بەڵێ.

**رزگار:** سبەینێ پێکەوە دەیبەینە چاپخانە.

**سیروان:** سبەینێ پێکەوە دەیبەینە چاپخانە.

**هیوا:** گوێ بگرن ـ تکایە ! گوێ لەم دێڕە بگرن !

(لەناکاو هەموویان بێدەنگ گوێ هەڵدەخەن)



**هیـوا:** (چاوی لەسەر کتێبەکە، کۆپلە شیعرێکی فەرەیدوون دەخوێنێتەوە).

" تۆ، ئەی هەمیشە دەربەدەر، ئەی هەمیشە بێ وڵات !

**رزگار:** زۆر وڵاتی دیکەش دەگەڕێی !

**سیروان:** زۆر سەرزەمینی دیکەش پەی دەکەی !

**بارام:** لە کۆتاییدا

**هیوا:** بە تاقی تەنیا

**سیروان:** دەگەیتە سەر کەنارێکی ون

**بارام:** لەوێش

**هیوا:** ئەستێرەیەک دێ

**رزگار:** دادەبەزێتە سەر جەنتا لمینەکانت ".

**پەردە**

**پاریس ١٩٩١/٨**

مۆنۆدراما

## دوایین رۆژەکانی ژیانی ژەنەراڵ شەریف پاشا



ژوورێکی نیمچە تاریکی هوتێلێک. قەرەوێڵەیەکی شڕ. کورسی و مێزێکی شەپرێو. چەندین بوتڵە شەرابی بۆش. قوونکە جگەرە. رەسمێک بە دیوارەکەوە لار بۆتەوە، خەریکە بکەوێ. شەریف پاشا لە خەو رادەچڵەکێ. پەککەوتە، پیر؛ بە پرتاو بەتانیەکەی لەسەر خۆی لادەبا. هەناسەیەک هەڵدەکێشێ. سەری خۆی لەنێو دەستەکانیدا دەگرێ:

هەموو نیوە شەوێک، ئەمە حاڵمە! هەموو نیوە شەوێک لە قووڵایی خەونەکانمەوە رادەچڵەکم.. بۆ منداڵیم دەگریم، بۆ سلێمانی! ... ئاخ سلێمانی!

خوا بە خێری بگێڕی! چەنێک خۆش بوو! منداڵ بووم. شەرواڵێک و کورتەکێکی خاکیم لەبەر دەکرد، ورد ورد بەرەو مەکتەبی روشدیە هەنگاوم دەنا. دەچووم لەسەر کورسییەک دادەنیشتم. تەنیشتێکم شێخ مەحموود بوو، تەنیشتی دیکەم رەشید زەکی کابان. رەشید دوو ساڵ لە من گەورەتر بوو. شێخ مەحمودیش ... " شێخ مەحموود" ! ئەرێ ئەوە بۆ ناڵێم " مەمحوود "؟ لە منداڵی، نەمدەزانی ناوی بهێنم، هەر پێم دەگوت " مەمحوود". بە رەحمەت بێ، شێخ مەحموود؛ ئەو منداڵە گورنەتەڵەیەی کە گەورە بوو دە وڵاتی هەژاند! پێکەوە گەورە دەبووین، پێکەوە خەمان دەخوارد، پێکەوە دەژیاین. کێ دەیزانی ئەو منداڵە کەپوو بە چڵمە دەبێتە ئەو سەرکردە گەورەیەی کە ئینگلیز لێی بترسێ؟ هەزار حەیف و مخابن: یادی ئەو رۆژە خۆشە دوورەدەستانە دەمکوژێ. دەمکوژێ.

(ماندوو، دەچێ پەنجەرەکە دەکاتەوە)

کورسییەکانی مەدرەسەی روشدیەمان، درەختە جوانەکانی گۆیژە، ئاوەکەی سەرچنار، خواجەکانی، میرزا و

مامۆستاکانمان، ڕەشید زەکی کابان، مستەفا پاشای
یامولکی، تۆفیق ـ بەم دووایییە کە گەڕابۆوە، دەڵێن ناوی لە
خۆی نابوو پیرەمێرد ـ هەقیەتی. ئاخ، ئەی هاوڕێکانم
(دەگری و دەقیژێنێ) ئەی هاوڕێکانی منداڵیم؛ بیرتان دەکەم!
(بە دەم قوڵپی گریانەوە)

ئەو ڕۆژە خۆشانە ڕۆیشتن. ناگەڕێنەوە. ناگەڕێنەوە. مرۆڤ لە تەمەنی گەورەییدا، ڕاستە، هەموو تێکۆشان و هەوڵێکی لەپێناو ئەوەیە کە بتوانێ منداڵیی خۆی وەدەست بخاتەوە ! بەلام... ئەمە کارێکە تەنیا شاعیر و هونەرمەندەکان دەتوانن بیکەن، نەک سیاسەتمەدارێکی فاشیلی وەک من. خۆزگە منیش شاعیرێک بوومایە و بمتوانیایە مانایەک بدەمە ئەو منداڵییە لەدەستچووەی خۆم؛ بمتوانیایە منداڵی و گەنجێتییە دوورەدەستەکەی خۆم ڕزگار بکەم. ئەو منداڵی و گەنجێتیەی کە ئێستا، وردوخاش، هەر پارچەیەکی لە لایەک، هیچی دیار نیە. هیچی لێ نازانم ! نازانم چۆنە! من لەوە ماندووترم کە بتوانم وەبیرە خۆمی بهێنمەوە. ئاخ سلێمانی! ... سلێمانی! دەڵێن بەم دووایییە خەریکە وێرانتر و وێرانتریش دەبێ. چۆن وێرانتر نەبێ ؟ هەرچی گەورە و هەرچی دڵسۆز و هەرچی شەریف و هەرچی بەخشندە و پیاوماقووڵ هەبوون، هەمووی لەناوچوون، سەری خۆیان هەڵگرت و بە وڵاتانی غەریبی کەوتن، یانیش کوژران و شەهیدبوون و لە سێدارەی دوژمن دران؛ یەکە یەکە وەک ئەستێرەی دەمەوبەیان ئاوابوون.

(هەڵدەستێتەوە سەیری ئاوێنە دەکا)

هەر تۆ ماوی، شەریفە قۆز ! تۆ ! تۆ لەوانەیە دوایین پیری ئەم جیلە بیت! دووایین دڵسۆزی ئەم میللەتە پەڕاگەندە و



ئاوارەیە ! دوایین غەریبی لە غەریبی کەوتووی کورد ! شەریفە قۆز ! ئەم نازناوەشت هەر لە تورکەکانەوە بەسەر دابڕا. تورک ئەم ناوەیان لێت نا. شەریفە قۆز ! تف لە تورک ! گەندەترین و بێ وەفاترین میللەتی سەر ڕووی زەمین؛ وەفایان تەنانەت بۆ دایکی خۆشیان نیە. عەبدوللا جەودەتی بەستەزمان، عەبدوللا جەودەتی هاوڕێم، لە ١٨٨٩ لە ئەستەمبۆڵ ڕێکخراوی ئیتیحاد و تەرەقیی بۆ دامەزراندن بۆئەوەی لەدەست دکتاتۆریەتی سوڵتان ڕزگاریان بکات، سەرجەم شانۆگەرییەکانی شکسپیری بۆ یەکەم جار بۆیان تەرجەمە کردە سەر زمانی تورکی.. وەلحاسڵ زیاتر لە نیو سەدە خزمەتی تورک و تورکیای کرد، کەچی هەر ئەوان بوون، هەر کە لە ١٩٠٨ حوکمی مەشرووتەیان گرتە دەست، ئەویان بە خائین و غەیرە دین لە قەڵەم دا، سێ چوار جاران گرتیان، نەفیان کرد، چاپخانە و کتێب و گۆڤارەکەشیان لێ سووتاند و فڕێیان دایە ڕووباری ئەستەمبۆڵەوە. ئەگەر ئەو تورکانە هەر لە بنەڕەتەوە دژی کورد نەبوونایە بۆچی ئاوها ڕەفتاریان لەگەڵ نووسەرێکی کورد دەکرد. ئەمەیە وەفا و غیرەتی تورک. شەپقەی ئەورووپایان لەسەر خۆ نا و کوردیان لەبیر کرد. خەتای خۆمان بوو. کەرێتی خۆمان بوو. دەبووایە زووتر بمانزانیایە چ خوێنێکی گەن لە دەمارەکانیاندا دەگەڕێ. ئەوەتا خۆشم...

(دەچێتەوە بەرامبەر ئاوێنەکە)

شەریفە قۆز ! ژەنەڕاڵی لەشکری سەربازییان بووم، بە درێژایی دە ساڵ سەفیری دەوڵەتیان بووم لە ستۆکهۆڵم. لە پاریس حزبی ڕادیکالی عوسمانیم بۆ دانان. لەگەڵ عەبدوللا جەودەت و دەیانی دیکەی کورد، بەرگریمان لە مافی تورکیا و

تورکەکان دەکرد، کەچی ئەوەتا ـ سەیری خۆت بکە !
(بەرامبەر ئاوێنەکە)

ئێستا هەست بە پەشیمانی و رووزەردی و کەرێتی خۆم دەکەم؛ هەست دەکەم بە درێژایی هەموو ئەو دە ساڵە لە کەر کەرتر بوومە. بە خۆم دەڵێم: یاخوا سەگ بتخوا؛ بۆچی ئەو تەمەنە درێژەی خۆتت لە ئەوەڵەوە لە خزمەتی کوردستاندا سەرف نەکرد؟ ئێمە هەموومان، جیلی کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتای ئەم سەدەیە، جیلی کوردە عوسمانییەکان، ئەو جیلەی کە عەبدوللا جەودەتی هاورێم پێی دەگوتن " کوردە گەنجەکان"؛ جیلێکی کەر بووین و خزمەتی بێگانەمان کرد؛ هەمووومان لە خەوی غەفڵەتدا دەژیاین، درەنگ بەخەبەر هاتینەوە. کە بەخەبەریش هاتینەوە، زۆر درەنگ بوو، پێستمان چووبووە دەباغخانە. ئەوەتا تەمەنم حەفتا و چەند ساڵێکە، هەست دەکەم پەنجا ساڵە مردووم. چۆن وا هەست نەکەم. چەند تێکۆشام و چەند هەوڵم دا، هەمووی هەر بۆ بەرژەوەندیی تورکیا و تورکەکان شکایەوە، لە کۆتاییشدا کوردیان لە تورکیا وەدەرنا و گوتیان: " تورکیا تورکلەریدەر". کە بێداریش هاتمەوە، زۆر درەنگ بوو. ئەو کاتە تازە جەنگی یەکەمی دنیا خەریک بوو کۆتایی دەهات، ورەم هێشتا هەر بەرز بوو، وەختی ئەوە بوو ئینگلیز و فەرەنسا و رووسیا رۆژهەڵاتی ناوەڕاستیان بەسەر خۆیاندا دابەش دەکرد، ئیدی دەستم پێکرد: لەم سەفارەتەوە بۆ ئەو سەفارەت، لەو وڵاتەوە بۆ ئەو وڵات: ئەمریکا، لەندەن، ئەستەمبۆڵ، قاهیرە، پاریس، ژنێف، ستۆکهۆڵم.. دەستی ولسۆن ماچ بکە، دەستی کلیمەنصۆ ماچ بکە، راکە لای فلان گەواد، بچۆ لای فلان پیاوماقووڵ و سیاسیی گەورە.



قاچم لە پاریس بوو، بیرم لە بریتانیا، دڵیشم لە کوردستان... هەتا توانیم لە کۆنفرانسی ئاشتیی ١٩١٩ لە پاریس، بڵێم: کوردستانێک هەیە و بێ دەوڵەتە! هەتا توانیم بڵێم: کورد پێویستە دەوڵەتێکی سەربەخۆی هەبێت! لە کۆتاییشدا، دووای ئەم هەموو ماندووبوون و هەوڵ و قورپێوانەی کردم... هیچ ! هەمووی بووە هیچ. هیچ. هیچ. پەیمانی سیڤەر بریتی بوو لە چەند کاغەز و مۆرێکی ئیمزاکراوی درۆزن. دەوڵەتی چی و حاڵی چی؟ تورکیا تورکلەریدەر! تورکیا هەموو شتێکی کوردی گا، بە منیشەوە. بە بەرچاوی ئینگلیزەکانەوە ـ کە زۆر رقیان لێم بوو ـ، نەفرەتیان لێدەکردم. (دەست بۆ ئاسمان درێژ دەکا) خوایەکا.. ئەو خەونە خۆشە چی بوو کە رۆیشت؟ ئەو خەونە خۆشەی کە کوردستان ئازاد بژی و منیش سەرەک کۆماری بم! کوردستان ئازاد بژیت. لە مەرەشەوە تاکو سلێمانی لەژێر دەسەڵاتی مندا بووایە! ئەوکاتە ...
(پێدەکەنێ)

ئەوکاتە شێخ مەحموودم دەکردە جێگری خۆم، جێگری سەرەک کۆماری کوردستان؛ عەبدوللا جەودەت: راوێژکاری سیاسیم و وەزیری رۆشنبیری؛ سمکۆ: وەزیری لەشکر؛ عەبدولرەحمان بەدرخان: وەزیری پەروەردە... ئاخ؛ چ خەونێکی جوان بوو ! ئێواران لە مۆن کێف لەناو باخچەی قەسرەکەی خۆم دادەنیشتم و خەونم بەو دەوڵەتە کوردییەوە دەبینی کە پایتەختەکەی سلێمانی بوو: قاچی راستی لە کرمەنشا، قاچەکەی دیکەی لە مەرەش بوو! چ خەونێکی جوان بوو، خوایە ! (لەسەر کورسییەکە دادەنیشێ) خەون بوو! رۆیی...

(هەڵدەستێتەوە)

یەکەمین چووزەرەی ئەم خەونە لە پاریس لە ١٩١٤ هاتە مێشکم. ئیتر ڕۆژ بە ڕۆژ لەگەڵم گەورتر دەبوو. سوڵتان عەبدولحەمیدیش هەر ئەوەی خێر بوو کە منی لە ساڵی١٨٩٩دا کردە ئەمباسادۆری عوسمانی لە ستۆکهۆڵم. ئەم نەفەرەتلێکراوە، باش بوو نەیدەزانی کوردم، دەنا داینەدەنام. چما ئە وەختە من بۆ خۆشم دەمزانی کوردم، دەمزانی کورد چیە ؟ ئەو کاتە تەنیا عوسمانی هەبوو. تورک عوسمانی بوو، ئەرمەن عوسمانی بوو، کورد عوسمانی بوو، عەرەب عوسمانی بوو، چەرکەس عوسمانی بوو. نە وەڵلاّ بۆ خۆشم نەمدەزانی کوردم. بەلاّم کە گەیشتمە ستۆکهۆڵم دەمدیت ئەڵمانیەک دەیگوت ئەڵمانیم، ئینگلیزێک دەیگوت ئینگلیزم، سوێدییەک دەیگوت سوێدیم. منیش ڕۆژێک بیرم کردەوە، گوتم باشە ئەدی من چیم ؟ دەبێ منیش شتێک بم. ئەو کاتە لە کوردستانیش شەڕ و شۆڕ و ڕاپەڕینەکان بڵێسەیان سەندبوو. ئیتر ئاوها، هەستی پڕ سوێی بێ وڵاتیم لە ئاخر و ئۆخری ژیانی ستۆکهۆڵمەوە دەستی پێکرد. یەکەمین چووزەرەی هەستی کوردایەتیشم لە پاریس؛ هەستی ئەوەی کە کوردم و دەبێ کوردستانێکی ئازاد هەبێ. (پێدەکەنێ) ئازاد...

مەشرووتەخوازانی ١٩٠٨ بوون کە هەموو شتێکیان لە کورد تێکدا. هەر هاتن و نەهاتن، بە ناوی عوسمانییەوە هەموویان لێ وێران کردین. کوردی بەدبەخت هەر تەنیا بەوە ڕاگەیشت کە یەک دوو قوتابخانە و نادی و جەمعیەت بۆ خۆی لە ئەستەمبوڵ پێکەوە بنێت. چوار پێنج ساڵی نەبرد ئەوەشیان لێ تێکداین. ساڵی ١٩٠٨ داوام کرد بمکەنە



ئەمباسادۆری عوسمانی لە پاریس، چونکە کورد بووم ڕازی نەبوون. بۆ ڕازی نەبوون ؟ چونکە کورد بووم. خۆیان وایان لێکردم لە دژیان ڕاوەستمەوە. سەرەڕای ئەوەش تاوانباریان کردم بەوەی مەحموود پاشام کوشتووە و غیابیەن ئەمری ئیعدامیان بۆ دەرکردم. منیش لە ڕقەبەریی ئەوان هەستام حیزبی ڕادیکالی عوسمانیم لە پاریس دامەزراند. فەرەنسا لە خوای دەویست حیزبێکی وەک حیزبە ڕادیکالەکەی من دژی تورکیای ئەو کاتە دروست ببێت، پشتیوانیی ماددییشیان کردم. پاشان کە ئیتر جەنگ لە ١٩١٤دا دەستی پێکرد، دنیا بووە یەک پارچە ئاگر. ئیتر منیش وازم لە حیزبەکەم هێنا و دانیشتم. لە هەرچوار قوڕنەی دنیا شەڕ و فەرتەنە بوو، منیش لە مۆنتی کارلۆ دانیشتبووم، بە مۆنتی کارلۆم دەگوت مۆن کەیف. ئنجا بەڕاستیش کەیف بوو. هەموو دنیا سەرقاڵی جەنگ بوو، منیش لە ڤێللاکەی خۆم دانیشتبووم. دووای ڕابواردن و خواردنەوە و قومار، کاتێ لە نایت کلەبەکانەوە، سەرخۆش، دەگەڕامەوە ماڵەوە؛ لە کاتژمێر دوازدەی نیوەشەو بەولاوە دادەنیشتم بەدیار پێکی وێسکییەوە دەگریام؛ بیرم لە چارەنووسی کوردستان و داهاتووی کورد دەکردەوە. چۆن مەفەڕێک بدۆزمەوە بۆئەوەی بتوانم ئەم جارەیان بە بیرێکی کوردانە تێ هەڵبچمەوە و داوای دەوڵەتێکی کوردی بکەم ؟ ئێوارانیش، پێش چوونە دەرەوە، هەر چی کتێب بە فەرەنسی و ئینگلیزی لەبارەی کورد و مێژووی کوردستان نووسرابوون، دامدەنانە بەردەم خۆم، دەمخوێندنەوە بۆ ئەوەی بتوانم پێش هەر داخوازینامەیەک زەمینەیەکی باش بۆ ڕۆشنبیریی خۆم دروست بکەم. هەر کە لە خوێندنەوەش بێ تاقەت دەبووم، سەرلەنوێ

شەوان سەرم دەکردەوە نایت کڵەبەکان بۆئەوەی کەمێک لەناو ژناندا دەردی خۆمم بیر بچێتەوە. هەندێ جار، لەناو ئەو کەیف و سەفایەی خۆمدا، لەناو ژناندا هەستم دەکرد سوڵتانێکی عوسمانیی سەدەی شازدەهەمم. پارە، ئوتومبیل، ڤێللا، شەمپانیا، ژنە ئەڵمانی، ژنە فەرەنسی... ژنی هیچ میللەتێک نەما لەگەڵی نەخەوم.. هەمووشیان بوونە حەسرەتێک و بیرەوەرییەکی تاڵ. تاڵ. تاڵ وەکو رابردوو. تاڵ وەک پیری، وەک ئەمرۆ. ئەوەتا...

هەر لەوێوە بوو ئەم شەریفە قۆزەم دوواکەوت. لە پارە و سامانەوە تا کەشخەیی.. هەموو شتێکم هەبوو. ئینگلیزەکان خۆشیان نەدەویستم. سەگبابانە، دەیانگوت شەریفە قۆز پارەی زۆرە، بۆیە کوردەکانی تورکیا خۆشیان دەوێ و دووای کەوتوون. ئەوان وایاندەزانی لەبەر دەوڵەمەندیمە کە کورد منی بە نوێنەری خۆی داناوە. نەیاندەزانی کە من چ پرۆپاگاندەیەکی گەورەم بۆ خۆم لەناو کوردەکانی قاهیرەدا دەکرد. نەیاندەزانی چ رێکخستنێکی گەورەم لەناو کوردەکانی ئەستەمبۆڵ و دیاربەکردا دروستکردبوو. مەگەر تەنیا شێخ مەحموود هەمان شتی لە کوردستانی عیراقدا دروستکردبێت. ئەو ئینگلیزە بێ شەرەفانە دەیانگوت خەڵکی کورد میللەتێکی موسڵمانی هەژار و بێپارەن، بە دەوڵەمەندی و پارەی شەریفە قۆز هەڵخەڵەتێنراون. ئینگلیز نەیاندەویست دان بەوەدا بنێن کە مەسەلەکە مەسەلەیەکی سیاسییە و دەمەوێ کوردستانێکی ئازاد هەبێ. پێیان خۆش نەبوو کە من سەرۆکایەتیی دەوڵەتێکی کوردی بکەم. نەفرەت لە ئینگلیز، دەیانگوت شەریفە قۆز زۆر قەرووحە، بەڵام زۆر کەرە. بە چاوی خۆم دەیان جار ئەمەم لە رۆژنامەکانیاندا



خوێندبووە. هەر ئەوانیش رێگەیان نەدایە شێخ مەحموود لە لوبنانەوە بگاتە پاریس و ببینێم.

(تەماشای دەوروبەری خۆی دەکا: بوتڵە عەرەق، قوونکە جگەرە)

ئای، هەی... ژن، ڤێللا، ئوتومبیل، شەمپانیا، پارە، دەوڵەمەندی، کەشخەیی... ئێستاش، ئەوەتا، لە پاریس، لە ئوتێلێکی دەرەجە پێنجی ئەرمەنییەک کەوتووم و پارەی ئەم سەرە مانگەم بۆ نادرێت. پارەی جەمێک خواردنی ئێوارەم نیە...

(دەچێتە لای پەنجەرەکە)

ئەم پەنجەرەیە ناکرێتەوە. ئەگەر بشکرێتەوە، پەنجەرەی غەریبیە، پەنجەرەی دوورەوڵاتییە. من لەم پەنجەرەیەوە کەس نابینم، کەس نامبینێ. کەس نامبینێ.

(دەگری)

کەس نامبینێ..

(لەناکاو بە حرسەوە هاوار دەکا)

ژەنەراڵ. ژەنەراڵ. ژەنەراڵ شەریف پاشا. سەرۆکی حکومەتی کوردستان.. پارەی ئەم سەرە مانگەی هوتێلەکەی بۆ نادرێت، پارەی جەمێک خواردنی ئێوارەی نیە...

تف. تف لە غەریبی. تف لە بێ وڵاتی. تف لە دەردی بێ دەوڵەتی...

(چۆکێکی لەسەر عەرزە و دەگری. لەناکاو لە دەرگا دەدرێ. سێ نامەی دەدەنە دەست. بە شاگەشکەیی و بە پەلەپرووزێوە نامەی یەکەم دەکاتەوە. دەرگاکە پێوە نادا. لە دەرەوەڕا دەنگی مۆسیقای پایزەکەی ڤیڤالدی دێتە ژوورەوە. نامەکە دەخوێنێتەوە.)

برای گەورەمان، شەریف پاشا، نووری چاوانم...
زۆر نیگەرانم و هەست بە ئازاریکی گەورە دەکەم، کە دەزانم جەنابت ـ کە رۆژی لە رۆژان دانرابوویت ببێتە سەرۆکی حکوومەتێکی سەربەخۆی کوردستان ـ کەچی ئەمڕۆ موفلیس بوویتە و لە پاریسەوە داوای پارەت لە نووسەرێکی کەساسی وەک من کردووە. منێک کە ئێستا، بەداخەوە، لە جەنابی پایەبەرزت زۆر موفلیستر و بێ پارەترم.
شەریف گیان،
لە هەموو دارات و سامانی بەدرخان پاشای باوکمەوە، کە بە ملیۆنان بوو، تەنیا رەزێکم مابوو و کارم تێیدا دەکرد، ئەویش مانگی رابردوو فرۆشتم و دامەوە قەرزەکانم. باوەڕم پێ بکە ئێستا موفلیسم. هیچم نیە بۆتی بنێرم. لەگەڵ ئەم نامەیەی تۆدا نامەیەکم بۆ کامەرانی برای بچکۆلەم نووسیوە لە بەیرووت، بەڵکو ئەو لەوێوە ـ ئەگەر هەیبێت ـ هەندێ پارەت بۆ بنێریت.
چاوت ماچ دەکەم و داوای لێبوردنت لێدەکەم.

**ئیمزای**
**جەلادەت بەدرخان**
**دیمەشق**

(نامەی دووەم دەکاتەوە)
برای گەورەم، شەریف پاشا،
چاوانت ماچ دەکەم.
هەست بە کەمی و شەرمەزارییەکی گەورە دەکەم، کە ئەمڕۆ منیش لە تۆ گەلێک موفلیستر و بێ پارەترم. بمبوورە هیچم نیە بۆتی بنێرم. بیر لە خۆکوشتن دەکەمەوە.



**ئیمزای**
**قەدری جەمیل پاشا**
**دیمەشق**

(نامەی سێیەم دەکاتەوە)
زۆر بەڕێز، ئەی ئەو کەسەی بە ناوی شەریف پاشاوە نامەیەکت بۆ کاک عوسمان سەبری شاعیری کورد ناردبوو.
لە نامەکەتدا، وەک دەردەکەوێ عوسمان سەبری برادەرێکی نزیک و خۆشەویستی بەرێزتانە و داوای پارەتان لێی کردبوو کە بۆتان بنێرێ بۆ پاریس. بەڵام زۆر بەداخەوە پێتانی رادەگەیەنم کە ناوبراو ماوەیەکی زۆرە لێرە نەماوە و نەفی کراوەتە مەدەغەشقەر. لەوێ بە دەسبەسەری و بە نەفیکراوی دەژی. ناونیشانی نازانم.
من پیاوێکی جوتیاری دراوسێی ماڵی ئەوانم. بە ئەرکی خۆم زانی کە لەجیاتی ئەو ئەم جەوابەتان بۆ بنووسم.

**ئیمزای**
**فیکرەت رەسووڵ ئەڵڵاوێردی**
**دیمەشق**

(خاوەن هوتێلە ئەرمەنیەکە سێ پۆلیسی هێناوەتە سەری و بە پۆلیسەکان دەڵێ):
سێ سۆ مسیۆ کی ناپازەنکۆغ پێیێ سێ لواییێ. ئیلفۆدغێ لەمپغیزۆنییێ، تووت سویت.

**پاریس: ٨ی ١٩٩١**

شانۆنامەی یەک پەردەیی

# ز

نووسینی: سەڵاح عومەر، هاشم سەڕاج، عەباس عەبدوڵڵا یووسف، رزگار عەبدوڵڵا، فەرهاد پیرباڵ



شوێن: هەر شوێنێک لە شاری هەولێر. کات: هەر دەمەوساتێکی ساڵی ١٩٩٤. کەسایەتیەکان: چوار پیاو دانیشتوون، پاشان پیاوی پێنجەم و ئینجا رۆژنامەنووسێک. رووناکی رۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە دیاریکردنی دیکۆر و شوێن و کات و گۆڕانە لەناکاوەکانی شوێن و کاتدا.

**زازا:** < رووەو پەنجەرە پاڵکەوتووە و دەستی ناوەتە پشت سەری> ئەگەر ئەم تۆپەی سەر قەلاّ روو لە شیراتۆن بتەقێندرێ، هەولێر وێران دەبێ و منیش بەشێتی دەگەڕێمەوە سوێد.

**زریان:** < بەدیار پەنجەرەوە> ئەم ئێوارەیە، دیارە، ئێوارەیەکی شوومە. سەیرکەن: ئەم ناوە هەمووی ترسێکی تۆقێنەری لێنیشتووە. دەرگاکان هەر لە خۆیانەوە پێوەدراون، وەک ئەوەی شتێکی سیحرئامێز دەستیانی پێوە نابێ. دڵم داخورپاوە، خەریکە ترس گیانم دەتەنێ. بە کوێدا بڕۆم؟ ئەم دەرگا شوومەی بەرامبەرم، خۆی وەک دێوێک مەلاّس داوە. ناوێرم هەنگاو بنێم. لە دەرەوەش دەنگی هاوەن دێ. ئەوێ خراپترە، ئاگربارانە. ترسی ژوورەوە و ئاگربارانی دەرەوە تێکەڵ بە یەکتر دەبن و دەمانسووتێنن، دەمانهاڕن، تەڕ و وشکمان تێکەڵ دەکەن. ئەم باڵەخانەیەمان بەسەردا دەڕمێنن.

**زاهیر:** من مێشکم زۆر لەوە ماندووترە بیر لەم شتە قۆڕانە بکەمەوە. دەشڵێن: ڕۆشنبیری کورد پێویستە لەئاست ئەم شەڕی براکوژیە هەڵوێستی هەبێ. ترحیو.

**زامار:** ئینگلیز پەندەکی هەیە دەڵێ: East or West, home is best . لەوەتی هەم حەوت باڵم دایتە خۆم، بەلاّم هەر لێرەم و چەقم گرتووە. ئای کە ئەمە زیانێکی زۆری پێگەیاندم. لە سەرەتای لاویمدا فێری ئەوە بووم: ئێرە، دەردی ئێرە، ژانی ئێرە، ئێرە کەرەسیسەیە. نالێم ترحیو.( بە زرتەوه) حیوتر.

**زازا:** < هەڵدەستێتەوە> لە سەردەمێکی زۆر غەدداردا دەژین. هەرچۆنێک بێ، دەبێ ئەم شەڕە رابگیرێ.

**زاهیر:** ئەم میللەتی کوردە پێویستە بەیەکجاری بگەڕێتەوە



ناو چیای کاردۆخیەکان یانیش ئەوەتا بیر لە بنیاتنانی ژیانێکی شارستانی بکاتەوە؛ ناکرێ بە عەقڵی شاخ لەناو شاراندا بژین. ئەرێ زریان، وابزانم زاگرۆسیش دێتە لامان بۆ ئێرە؟

**زریان:** ئەو برادەرە خاوەن کۆشێک منداڵە، لەوانەیە هێشتا نەهاتبێتەوە. نازانم بۆچی دوواکەوت؟ شتێکی بەسەر هاتووە. وا باشە بچم سۆراغێکی بکەم. رۆژی ئەوە نیە پیاو لە دەرەوە بمێنێتەوە.

**زامار:** ئاخ! پاش ئەوەندە زانینپەرستییە، گەیشتمە قەراغێک کە هەموو شتێک نێوچەوانە. پرسیار ناکەم بۆ؟ دەزانم گاڵتەیان بەم پڕوپووچانە دێت. منیش دەیشارمەوە. ناڵێم وایە، بەلاّم بە چرپە و رازی ناو دلاّن دەڵێم: نێوچەوانە.

**زاهیر:** ئەوا زاگرۆس هات. هات. سالاّنێک بوو رۆشنبیری کورد بە برسێتی و حیزی و زەبوونی رازی بوو، وا ئێستا شەڕی براکوژیشی هاتەسەر. رۆشنبیری کورد پێویستە لەئاست ئەم شەڕەی براکوژی هەڵوێستی هەبێ. ترحیو.

**زاگرۆس:** < بە شپرزەیی و پڕتاویەوە، وەک ئەوەی هەواڵێکی ترسناک رابگەیەنێ> جەماعەت، درنگەی تۆپە رەنگاوڕەنگەکانی بلیارد و و تۆپە عاجە جوانەکان بەردەوامن!

**زازا:** دەزانم!

**زریان:** ئەگەر ئەوەی زاگرۆس دەیڵێ راست بێ، ئەوا هەموو شتێکمان بوو بە بڵقی سەر ئاو، دنیامان بەسەردا دەڕمێ. دەبێ کۆچ بکەین. هەمان شت دووبارە دەبێتەوە. مردنمان لێ نزیک دەبێتەوە.

**زازا:** من غەمی میللەتمە، داخوا پاش وێرانبوون چی بەسەر دێ! دەزانم سەرکردەکان هەموویان هەڵدێن و میللەت

بەجێدێڵن. منیش دەبێ دەستی ئیلهام بگرم و سەرهەڵگرین.
**زاهیــر:** تیو، لیو، لیو، لیو... رۆشنبیری کورد پێویستە لەئاست شەڕی براکوژی هەڵوێستی هەبێ.
**زاگــــرۆس:** شتە دانسقە و جوانەکانم تێکدەنێم و دەڕۆم، بەڵام بۆ کوێ؟
**زازا:** بۆ کوێ؟
**زاهیر:** بۆ کوێ؟
**زاگرۆس:** نازانم. خەریکە دەروونم شەق بەرێ. بەرگەی ئەم فشارە ناگرم. شەویش هێورم ناکاتەوە. ئەو هەموو ئەشتەبا نەشمیـلانەیەم بۆ کوێ ببەم؟ تازە بیر لە چی دەکەمەوە. درەنگە. خەریکە کات بەسەردەچێ.
**زامار:** ( س ) سەرنووسەری چاوەنۆڕکراوی رۆژنامەی " تڕ و فس " کە تایبەتە بە کەتن و ئۆینبازی لە مەچکۆدا، زۆر بەقەشمەری دەیگوت: " کاکە، مافی حەیوانی چی، ئەوە لێرە مافی مرۆڤ نیە. حاجی لەقلەقی خانەقا کوژرا نەکوژرا فلْقیر و جەهەننەم".
**زاگرۆس:** ئەوان گەمانی شەترەنج و دۆمینە دەکەن و تۆپە عاجە جوانەکان لێکدی دەدەن، بێچووەکان لەناو هێللانەدان و حاجی لەقلەقەکەش چەشنی کوتاڵە خامێکی چەرمگ لە دوندی منارەکەدا دەلەرێتەوە.
**زاهیــر:** کوڕینە، من چیتر لە توانامدا نەما. با هەندێ جیددی بین؛ ئەم ورێنانەی ئێوە وام لێدەکا بڵێم:" ئێوە بەپێچەوانەوە، هیچ یەکێکیان ناتانەوێ برۆن، ناتانەوێ ئێرە بەجێ بێڵن. ئێوە هەمووتان، بەردەوام باسی ئێرە دەکەن؛ زۆر پابەندی ئێرەن؛ ئێرەتان خۆش دەوێ! ". کاکی خۆم، ئێوە باسی چارەسەرێک بکەن، باسی رێگایەکی دەرچوون؛ با لەم



دۆزەخە دەربازمان بێ! ئێمە چۆن بتوانین لێرە دەرباز بین؟
**زازا:** پێشنیارێکی زۆر هاوچەرخانەیە، بەڵام ئایا ئەمە لە توانای ئێمەدا هەیە؟
**زریـــان:** مرۆڤ هێندە دڕندە و شەڕخوازن، گیانەوەریش دەربازناکەن. ئەم حاجی لەقلەقە بەسەزمانە چ تاوانێکی کردووە؟ دوێنێ ئێوارە بەسەر منارەکەوە هەڵنیشتبوو، بێچووەکانی لەژێر باڵەکانی چاوشارکێیان دەکرد.
**زاگرۆس:** ئاخر منیش بیر لەو ئافرەتە رەشپۆشە دەکەمەوە. کەح! دەزگاکانی رژێم زیندانییان کرد، هێندە بەر تەوژمی کارەبایان دا ئێستا هێلکەدانەکانی هێندە بەهێزن بە جمکە دەزێ.
**زامــار:** زۆر نووسەر هەن باسی ستراتیژ دەکەن، لە هەر ئاخاوتنێک کە موناسەبەش نەبێ ستراتیژبارانت دەکەن. ئەوانە دەبووایە باسی مەڕایەتیی میللەتیان بکردایە.
**زاهیـــر:** رۆشنبیری کورد پێویستە لەئاست ئەم شەڕی براکوژیە هەڵوێستی هەبێ. ترحێو! ئێوە هەمووتان درۆدەکەن، درۆدەکەن کە دەڵێن " دەڕۆین"! < روو لە چایچی> کاکە، زەحمەت نەبێ چایەکی تر!
**زریان:** ئەگەر چا نەخۆمەوە ژانەسەر دەمگرێ. چایەکی وای نەهێنا مێشکم پێی ئیسراحەت بکا. کارەساتی وا پێویستی بە یەک قوریە چا هەیە. خۆ ئەگەر پێکە عەرەقێکیش هەبووایە، ئەوا هەموو شتێکی لەبیردەبردمەوە، ئاگاشم لە دەرەوە دەبڕا.
**زازا:** برام، ئەم کێشەیەی نێوان ی.ن.ک. و پ.د.ک. مێژوویەکی کۆنی هەیە. سەرەتای سالانی هەشتاش شەڕی یەکتریان دەکرد، بەڵام ئەوکاتە خەڵکی شارەکان لە مەترسیی

شەڕی ناوخۆ نەدەگەیشتن. چونکە خەڵک هەرگیز نەیاندیبوو لە شارێکی وەک هەولێردا لە نیوەشەودا بە تۆپ و ئارپیجی لەیەکتربدەن و ملیۆنێک مرۆڤ خەوزڕ بکەن. ( سواری سەر ملی زاهیر دەبێ و هاواردەکا ) بژی پێشمەرگەکانی ی.ن.ک. و پ.د.ک ، کە لە نیوەشەودا شەڕە تۆپ بەسەر خەڵکی بێگوناهدا دەکەن!

**زاهیر:** ( هاواردەکا ) بژی پێشمەرگەکانی ی.ن.ک. و پ.د.ک ، کە لە نیوەشەودا شەڕە تۆپ بەسەر خەڵکی بێگوناهدا دەکەن!

**زازا:** بژی پێشمەرگەکانی ی.ن.ک. و پ.د.ک ، کە لە نیوەشەودا ...

**زاهیر:** بژی پێشمەرگەکانی ی.ن.ک. و پ.د.ک کە لە...

**زازا:** بژی پێشمەرگەکانی ی.ن.ک. و پ.د.ک...

**زاهیر:** بژی...!

**زاهیر:** ( لەژێر ملی زازا دێتە دەرەوە، ماندوو، رووەو زاگرۆس دەڕوا ) ئاخ! زاگرۆس گیان، دەتوانی چیرۆکێکی رۆمانسیمان بۆ بگێڕیتەوە، بەڵکو کەمێک غەمی دڵمان برەوێتەوە!

**زاگرۆس:** مێزەکە چۆڵ و هۆڵە، خامە پانوپۆڕە سپیپاتەکە و تۆپە جوانەکان کش و مات. زرمەی تۆپ و هاوەنان دێ، دەمامکدارەکان کووچە و کۆڵان و سەربانەکانیان تەنیوەتەوە. چۆن چۆنی بڕۆم؟ ئاخر هەر نەبێ دیدەنی فرزەندەکانم بکەم و ئەوانیش دەربازبکەم. پاشان چی روودەدا؟ ئەستەمە هێور ببێتەوە. خەریکە هێز و دەسەڵات هەموو شتە جوانەکانی ئەم وڵاتە لەناو دەبەن.

**زاهیر:** ئەرێ با کەمێک جیددیتر بین! من حەزدەکەم



بیروراتان لەبارەی مەسەلەیەکی گرنگەوە بزانم! خەڵک و برادەرانی پێشوومان تاکو ئێستا هەر روویان کردۆتە وڵاتانی ئەورووپا. رای ئێوە چیە کە ئێمە هەر پێنجمان پێکەوە رووبکەینە ئیمارات یان رووبکەینە هیندستان؟ بە رای من هیندستان لە هەمووی باشترە. ئەوێ پڕە لە خوا. بۆ خۆمان دەچینە ئەوێ، بەڵکو خواکانی ئەوێ بەختێکی باشمان پێدەبەخشن. ها ؟ راتان چیە، بچینە هیندستان ؟

**زامار:** رای من رای ئەو ئەزنیفچیەیە کە بەتوندییەوە پوول لە مێز دەدا و دەقیژێنێ: " فشەی بە گەمەی مەکە!". دە سەیری کەن! ( زریان و زاگرۆس تەماشای دۆمینەچیەکان دەکەن).

**زریان:** بە رای من: با لەم پەنجەرانەوە بچینە دەرەوە و بە دیوارەکاندا شۆڕبینەوە، بۆئەوەی تا زووە خۆمان بگەیەنینە سەر شەقام. ئەم ماڵوێرانیە دەبێ کۆتایی بێت! ئەم شارە بۆچی کاول ببێت، ئەم شەڕە بۆ ؟

**زازا:** بە رای من ئەم حیزبانەی کوردستان لە ئاست داخوازییەکانی میللەتەکەماندا نین.

**زاگرۆس:** بە رای من ئەم ئاژاوە ناجۆر و دزێوە درێژەدەکێشێت.

**زاهیر:** بەخوا چارەنووسی منیش زۆر دیارە، دەزانم: من بە گوللە دەمرم، ئیتر چ لێرە، چ لە شوێنێکی تر. ئێمە نەوەیەکی بەدبەختین، بووینەتە قوربانیی ئەم شوێن و سەردەمە چەپەڵەی کە تیای لەدایکبووین. ئەم کۆبوونەوەیەشمان بێهوودەیە، ناتوانین تەنانەت لەیەکتریش تێبگەین. ئەوەتا باش دیارە کە چەند زەبوون و رۆح پەرتەوازەین! کۆبوونەوەمان لەجیاتی ئەوەی هێزمان بداتێ، لاوازتر و

غـەمگینتـرمـان دەکـا. من بۆ خـۆشم تـێناگـەم: بۆچی کـاتێ دەمەوێ بڕۆم و ئەم وێرانـە چڵپاوییەی ئێرە جێبهێڵم، یەکسەر هەستدەکەم کە من بە ئێرە و بە ئێوە بەستراومـەتەوە. تێناگەم بۆچی؟

**زازا:** دەڵێن دۆلار پیس بەرزبۆتـەوە. ئەرێ کـاکـە گـیـان دۆڵکەیەک ئاوی ساردمان بۆ دێنی؟

**چایچی:** بە قورئان بەفرمان نیە، ئاویشمان زۆر گەرمە.

**زامـار:** کە ئاو نەمێنێ نەهامـەتی گەردوونە. ئاو سەرچاوەی هەمـوو شتێکە. ئاو نەمێنێ، ئاو نەمێنێ، ئاو نەمێنێ، یانی ئاو نەمێنێ، ئاو، ئاو، ئاو...

**زریـان:** بریا ڕۆژێک زووتر مردبام و بەم ڕۆژە نەگەیشتبام. ئاخـۆ منداڵەکـانم لە مـاڵەوە وەزعـیـان چۆن بێت؟ تا نـەگـەمـە ماڵەوە ئاسوودە نابن. پیاو لە ماڵی خۆیدا بمرێ باشترە لەوەی لە شوێنێکی تر بێناز بکەوێ.

**زاهیـــر:** ئەرێ زاگـرۆس دەتوانی چیـرۆکـێکی ڕۆمـانسـیی دیکەمان بۆ بگێڕیتەوە!

**زاگـــــرۆس:** ئەوێ شـەوێ تـێـرم خـواردەوە، لەنـێـو سـەوزە فـریزێکی تێراو و جـواندا، نـیـمچـە سـەرخـۆش. تـێـر پێکەنیم. حـەمـەی موکـری ڕۆمـاننووسـێکی خودان خـەیاڵگەیە. من زۆرم خواردەوە. مەحموود زامدار ئەدیبێکی دڵ بێ بوغز و کینەیە. زۆرم خــواردەوە. لـەلای ئاوی کــەسـک و ســۆر لامــدا بەرەو هەیکەلی زەعیم.. لەشکرێکی سام لێ نیـشـتـووی خـەمگین. ئای، لەشکری براکوژی، لەشکری نەزۆک و شەرمەزار! ئێستا لە کـۆڵانـە تەنگەبەرەکـەدام و دەڕۆم، دەگـــەمـــە مــاڵ. زۆرم خـواردۆتەوە. وە ژوور کـەوتم. دایکم چارۆگـەیەکی سپـیی بە سەر داداوە و لە خوا و لە شێخە نەقشبەندییەکان دەپاڕێتەوە.



ئەو لە چللـەکێشـاندایە. خـەریک بـوو وریا و دارا مـاچ بکەم. "کـوڕم، ئاگاداربە، کوڕ نـاسکن، لێدەدرێـن". بەرەو مەغـسـەلە سـپــیــەکــە:" سـابـوونەکـە چی لێـهـات؟". هاوارمکرد؛ بە خاولیـەکی شـینی ئاسـمـانیـەوە وەسـتـابوو. دەونخـوون کـەوتم. کابووسی خۆکوژی دووچاری تۆقاندنی کردم.

**زاهیـــر:** ڕۆشنبیری کورد ساڵانێکی زۆر بوو بە برسێتی و حـیـزی و زەبوونـی ڕازی بوو، ئێـسـتـا شـەڕی براکـوژیشی هاتەسەر. ڕۆشنبیری کورد پێویستـە لەئاست شەڕی براکوژی هەڵوێستی هەبێ. تڕحێو.

**زازا:** دوێنێ دایکم وتی " ئەگـــەر وەک جـــاران بـەهێـــز بوومایە، لە بەردەم پەرلەمان بەدەم گریانەوە قوڕم لە سەر دەنا و دەپاڕامـەوە: شـەرم بکەن، مـیللەت برسـیـیـە، چەوسـاوەیە؛ وڵات وێران مـەکەن!". بەڵام خـۆ ئەم حـیـزبـانە گوێ لە کـەس ناگـرن. وتی:" دە وەڵڵاهی وەزع ئاوها بڕوا مـیللەت وڵاتـیـان بۆ بەجێدێڵن؛ ئەوسا با وڵات بەسەر خۆیاندا وێران بکەن".

**زاهیـــر:** فعلەن، لە کۆتاییدا تەنیا سەرکردەکان لەم وڵاتەدا دەمێننەوە!

**زازا:** وڵاتی حزبڕانی.

**زاهیر:** بژی حزبڕانیی حکوومەتی هەرێمی کوردستان!

**زازا:** بژی حزبڕانی!

**زاهیر:**بژی حزبڕانی!

**زامـــار:** من حاڵـەتەکە ناخەمـە بەر لێکۆڵینـەوە. دیراسـەی ناکـەم. سەرەنجامـەکان بۆ دەرچوون گرنگن. من بۆ کۆچکردن شێـر و خەت داوێم. ئێوەش بە ئارەزووی خۆتان. من وا شێـر و خەت داوێم...

**ڕۆژنـامـــــــەنووس:** < بێ لەدەرگـــادان دێتـــە ژوورەوە>

سەلامو عەلیکوم! داوای لێبووردنتان لێدەکەم ئەگەر دانیشتنەکەتان لێ تێکدەدەم. من ڕۆژنامەنووسم، لە ڕۆژنامەی " لاپەڕین" کاردەکەم. ماوەیەکی زۆرە زانیومە کە ئێوە نیازی سەفەرکردنتان هەیە. یەکیەتیی نووسەرانی کورد/ لقی هەولێر ئاگاداریان کردمەوە کە ئێوە بەتەمان هەمووتان پێکەوە کۆچ بکەن و وڵات بەجێ بێڵن. من هاتمە لاتان بۆ ئەوەی چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەنووسیتان لەگەڵ ئەنجام بدەم.

**زاهیر:** ڕۆشنبیری کورد بە برسێتی و حیزی و زەبوونی ڕازی بوو، ئێستا شەڕی براکوژیشی هاتەسەر. ڕۆشنبیری کورد پێویستە لەئاست ئەم شەڕی براکوژیە هەڵوێستی هەبێ. تڕحێو.

**ڕۆژنامەنووس:** حەزدەکەم چەند پرسیارێکتان ئاراستە بکەم کە هەندێکیان پەیوەندییان بەم کۆچکردنەی ئێوەوە هەیە، ئەوانی دیکەش پەیوەندییان بە حزبڕانیی حکوومەتی هەرێمەوە هەیە. ئەگەر ڕێم بدەن پرسیاری یەکەمی خۆمتان بەم شێوەیە ئاراستەدەکەم: ئێوە بۆچی دەڕۆن؟ بۆچی دەتانەوێ ئێرە جێبێڵن؟

**زریان:** ئەم ژیانە هێندە ناهێنێ کە مرۆڤ تا دەمرێ خۆی هەر بە یەک شت ببەستێتەوە. بارودۆخ مرۆڤ دەگۆڕێ. گۆڕان سەنگی مەحەکی هەموو شتێکە، بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا رابردوو لەبیرناچێتەوە. هەر دوێنێ دنیای شارەکەم بەجارێ گۆڕا، ئاسوودەیی لە ئاسمانی شارەکەمدا نەما. هەر بەسەر شەقامەوە ئافرەتێک منداڵێکی بەمردوویی بوو، دوو کەس خۆیان پیس کرد. زەمەن بۆ دواوە ناگەڕێتەوە، رووبارێکە و بەرەو پێشەوە دەڕوا. چەند خۆش بوو، ئێستا بە فرمانێک پەڕوباڵ لە لەشی خەڵک دەرچووبایە بۆئەوەی بەرەو



دوور هەڵفڕیبان، لەم بەندیخانەیە دوور بکەوتنایەتەوە، ئیکارۆس و دیدالۆس ئاسا. پەڕوباڵی لە مۆمدروستکراو نا، بەڵکو پەڕوباڵی ڕاستەقینەم گەرەکە.

**ڕۆژنامەنووس:** ئەی تۆ کاک زاگرۆس، تۆ بۆچی وڵات جێدێڵیت؟

**زاگرۆس:** لەبەرئەوەی چڵێسی جوانیم و حەزدەکەم تەماشای بکەم، چونکە شەکەت و ماندووم. من وابیردەکەمەوە کە"تۆپە عاجە جوانەکان ئەستێرەن و کەفەسابوونی پرتەقاڵییان پیا ڕژاوە.

**زازا:** چونکە حیزبەکان جیاوازی لەنێوان خەباتی ناو شاخ و خەباتی ناو شاردا نابینن. ئەگەر نا چۆن ئامادەی شەڕێکی وا دەبوون کە دڵنیان وێرانیی لەدوایە؟

**ڕۆژنامەنووس:** ئەی تۆ کاک زامار، تۆ بۆچی وڵات جێدێڵیت؟

**زامار:** من دەمانێکی دوور و درێژ عەودالی هۆناسی بووم. کە تاقە هۆیەکم دەدۆزیەوە، بە رووتی بەناو کۆڵانەکاندا غارم دەدا و هاوارم دەکرد: " دۆزیمەوە". پاشان کە لێکم دەدایەوە، هێدی هێدی خپ دەبووم، دەچوومە سەر هۆیەکی تر؛ ئەویش هەر وا. دوا جار بڕوام بە فرەهۆ هێنا. ئەویش فت. باشترین چارەنووس و بڕیار بڕیاری شێر و خەتە...

**زاهیر:** منیش بەکورتی دەڵێم: لەبەرئەوەی کورد میللەتێکی خێڵەکی و عەشایەرییە، ڕۆشنبیری کوردیش پێویستە لەئاست ئەم عەشایەرگەرییە هەڵوێستی هەبێ، تڕحێو. چ بکا؟

**زریان:** ئەگەر وابێ، هیچ شتێک بایەخی نامێنێ. وەک پرووست، ئەگەر بە فلینیش دیوارەکان دابڕێژم، ڕەنگە نەتوانم

خۆم دابڕێنم لەوەی لە دەرەوە روودەدا. تۆ بڵێی پرووست توانیبێتی هەست و نەست و هۆشی لە ژوورێکدا، وەک ئەوەی خۆی دەیویست، بەکاربێنێ! چی دەبوو مرۆڤ ئاژەڵ بووایە تا وەک ئەم پشیلەیەی ژێر ئەم مێزە لە کاتێکی وەک ئێستا خۆی بشارێتەوە. ئەگەر منداڵ بوومایە دەمقیژاند یان خۆم رووت دەکردەوە و بە جاداندا دەسووڕامەوە بۆئەوەی هەردوو لا شەرم لە خۆیان بکەنەوە و لە کەلی شەیتان بێنە خوارەوە.

**زاگرۆس:** مافی خۆمە بایەخی پێبدەم، بەڕاستی وێرانەییە. کۆچ و رەوە پڕ ئەشکەنجەکە وای پێڕاگەیاندم. بە دڵی ئیڤان کارامازۆڤ نەبوو.

( دەنگی تەق و تۆقی بەردەوامی دەرەوە بەرزتردەبێتەوە)

**زاهیر:** سالانێکی زۆر بوو رۆشنبیری کورد بە برسێتی و حیزی و زەبوونی رازی بوو، ئێستا شەڕی براکوژیشی هاتەسەر. رۆشنبیری کورد پێویستە لەئاست ئەم شەڕی براکوژیە هەڵوێستی هەبێ. ترحێو.گوێ ڕابگرن!

**زامار:** گوێم لێڕاگرت: یەک لەشکرە منداڵی بەڕەلا بە خۆیان و پەڕۆی رەنگاوڕەنگیان، بە دار و بەردیان لەسەر قەلات بوون. بە لاساییکردنەوە شەڕێکیان بەرپاکرد، پێش پارێزگایان بەردباران کرد، ئەو رۆژە هیچ کەسێکی لێ نەمابوو. گوێم لە هاواری یەکێکیان بوو: رامبۆ. لەگەڵ رامبۆ راچڵەکیم. رامبۆ، من خۆم کردبووە رامبۆ. رامبۆ هاوجەستەم بوو، هاوسەفەرم بوو. ئێستا رامبۆ پاڵەوانێکی بەدە. نازانم مامۆستایانی زمانی ئەدەبیاتی فەرەنسی بۆ دەنگی ناڕەزایی هەڵنابڕن. من لەجیاتی ئەوان بام نەمدەهێشت زنجیرە فیلمێک بەناوی رامبۆ دەرچێ. ئێستا رامبۆی شاعیرم



لەپێشچاوکەوت. منداڵەک تا گرتی نێزەدارێکی لە پشتی هاوڕێکەی دا و قیژاندی: رامبۆ.

**رۆژنامەنووس:** ببوورن، من واهەست دەکەم ئێوە لە بارودۆخێکی دەروونیی زۆر شڵەژاودان. قسەکانتان لە وڕێنە دەچێ، هەست دەکەم زۆر ماندوون. پرسیاری دووەمم ئەوەیە: ئێوە کەی بەتەمان بڕۆن؟

**زازا:** ئەگەر ئەم شەڕە تەشەنە نەکا، ئەوا کۆتایی مانگی سالی داهاتوو.

**زریان:** کاتێ شارەکەم ئازاد بوو، کۆت لە لەشم داپچڕا، مرۆڤ باڵندەی نەکوشت. کوندەبۆ بەسەر دیوارەوە نەمان. کینە لە دەروونی مرۆڤدا سڕایەوە، هەموو بوونە یەک جەستە و لەناو بۆتەی یەک رۆحدا توانەوە.

**زامار:** ئەو کاتەی خوێ شین بوو!

**زاگرۆس:** منیش ئەو کاتەی ئاگری هەلایساوی دەروونم دادەمرکێ. منیش بوونەوەرێکی سەیرم! ئاخر، کەی دادەمرکێ؟ زۆر جار بۆ عیشقی پەروەردەگار دەگریم و فرمێسکی گەرم و گوڕی دانە مرواری لە چاوانم دادەبارێن، بەڕاستی ئیماندارێکی هەمیشە شەڕابخۆرم.

**زاهیر:** منیش هەر وەختایەکی رۆژنامەنووسی کەر و کەودەنی وەک ئێوە هەمووتان کۆچتان کرد، ئینجا! چونکە ئێوە، هەر هەمووتان، تەنانەت نازانن نوختە و فاریزەش چۆن بەکاربێنن، کەچی دێن ئێمەومانانی بەدبەخت دەکەنە دەستاوەردی نانپەیداکردنی خۆتان. رۆشنبیری کورد بە برسێتی و حیزی و زەبوونی رازی بوو، ئێستا شەڕی براکوژیشی هاتەسەر. رۆشنبیری کورد پێویستە لەئاست ئەم شەڕی براکوژیە هەڵوێستی هەبێ. ترحێو.

**زریـان:** بۆ ئەوەی بتوانم لە ئێستادا بژیم پێویستە عەقڵ و هۆشم لەدەست بدەم.

**زاگـــرۆس:** ئاخ! زەمـەنە جـوانەکـان تێکشـکێنران. ئەگـەر بگەڕانایەتەوە، لەوانەیە دەسپێشخەریەکی چاکیان بکردایە!

**زازا:** ئەمە زەمەن نیە، کاتژمێری دەستی سیاسەتمەدارەکانە.

**زامــار:** کەسێکی تر هاتە ناو ئەم بازنەیە، بووە شـەشـەمین کەس. برادەرێکمە و ناتوانم ئاوڕی لێنەدەمەوە، وتی: میللەت بەرەو کـوێ دەچێ؟ سـەیری تەلەفـزیۆن دەکـەم. درەختـەکـان گەشن، بەڵام مرۆڤـەکان سیس. باش بوو، خۆی وەڵامی خۆی دایەوە.

**رۆژنـامـــەنووس:** ببـوورن، با من دووا پرسـیـاری خۆمـتـان لێبکەم: ئێوە کە دەڕۆن، دوای ئێوە، ئەم میللەتە قـوڕبەسەرە، بە رای ئێوە چی بکا؟

**زاگــرۆس:** با هەمـوو بەیانـیـان لەشـە جوانەکەی بەر دووش بدات و پەشـتـەمـاڵێکی سـەوز و سپی لە خـۆی بئـاڵێنێ و بە قـریوە و پێکەنینەوە سـەمـابکات، شـەوانەش لـە ئەسـتـێـرە دوورەکان رابمێنێت.

**زاهیـر:** پەشتـەماڵێکی سەوز و سپی لە خۆی بئـاڵێنێ و بە قـریوە و پێکەنینەوە سـەمـابکات، شـەوانەش لـە ئەسـتـێـرە دوورەکان رابمێنێت.

**زازا:** جامانەکانیان بکەن بە پێڵاو و کلاشەکانیشـیان بکەن بە شەپقە.

**زریـــان:** هیچ شتێ نەکا باشترە لەوەی بیکات و ئەو شتە بایەخی نەبێت؛ مـرۆڤ بۆچی رەنجی بە خەسار بـچێ کە هیچ شـتـێ نەهێنێـتــە دی؟ با هیـچ کــەسێ بـۆی نەبێ بەزەبر بیروبۆچوونی ئەوەی تر لە قاڵب بدا. ئەوەی وادەکات با بچێ



فـاڵ بگرێتـەوە، چاکـتـرە لەوەی درۆ و دەلەسـە و بوختـان بۆ یەکێکی تر دروست بکات و کۆنکرێت دابڕێژێ.

**زامــار:** هەرچی بکا.. جوانە. با بۆ خۆی هەر سەما بکات و گۆرانی بڵێت و لەش بـابدات... با ئارەزووەکانی لەش تێر بکات. پاشـانیش چ دەبێ با ببێ. ئازایەتی زیاتر لە ئافـرەت دەوەشێتەوە. ئافرەت لە پیاو ئازاترن، چونکە هۆیەکانی بزاڤی ئافـرەت: هەست بە کـەمـیـیـە؛ جـا زووتر پەرداخی خـۆی لە نۆشاوی ژین پڕدەکـا و لەبەریشی دەمێنێتـەوە. بـا سـەربەست بێ؛ چی دەکا با بیکا.

**رۆژنـامـــەنووس:** ‹ رووەو زاهیــر › ئـەی بە رای تـۆ، ئـەم میللەتە دوای ئێوە پێویستە چی بکا؟

**زاهیـــر:** هەی کـەرە، من وەڵامم دایتـەوە. یا نا؟ دەی، رام دەگۆڕم، دەڵێم: با هەموویان پێکەوە سەری خۆیان هەڵگرن و بچنە ئەورووپا! خۆ لەئاکامدا هەر وایشی لێدێت. رۆشنبیـری کورد پێویستە لەئاست ئەم شەڕی براکوژیە هەڵوێستی هەبێ، وا نیە؟

**رۆژنامەنووس:** سوپاستان دەکەم. من دەڕۆم. خواحافیز.

**( ماوەیەک بێدەنگی)**

**زاهیر:** باشە ئێستا چی بکەین؟

**زامار:** خۆت خەریک بکە؛ پێناسەی شتێک بکە!

( زاهیر بیردەکاتەوە)

**زاهیـــر:** لاوازە، لەرزوتایەتی، نەخۆشە، نان نیـە بیخوا، لە مـاڵەوە ئاویان نایە، کـارەبایان نیـە: تەنیـا رۆژێ دوو سـەعـات نەبێ. شەو لەبەر شەڕی براکوژی و تاق و تۆقی گوللە و تۆپ خــەوی لێناکــەوێ، دوو کــوری کــوژراوە، زۆر دڵتـــەنگە،

مووچەکەشی سێ سەد دینارە و نرخی کیلۆی گۆشتیش سەد دینارە. ئەمە چیە؟ من شەخسیەن، خۆم نایزانم.
**زازا:** بڵندترین منارەیە لە دنیا، وابزانم ٥٥٣ مەتر بەرزە.
**زریان:**گەڕانەوەیە بەرەو سەرەتا، رۆحی مردوو دەچێتە نێو جەستەی یەکێکی تر، واتە مرۆڤێکی تر بە هەمان رۆحی مرۆڤە مردووەکە لەدایک دەبێ.
**زاگرۆس:** فڕندەیەکی توندوتیژی ئاگرگەرمە، دژی هێمنی و ماتییە.
**زامار:** من هەموو بەرگە قەبەکانی دانایی و فەلسەفەم پشکنیەوە، بە کەیفی خۆم لەناو فیردەوسی حیکمەتی چینی و هیندستانی و گریکی و میسری و ئیتر گەڕام.. بەڵام سەیرە، لای خۆمان شەڕ لە بەتاڵی باشترەم دیتەوە. پەندێکی کوردییە. شەڕ لە بەتاڵی باشترە.
**زاهیر:** ئەرێ ئێمە کەی دەڕۆین؟
**زاگرۆس:** من دەچم جلوبەرگە وشکبووەکانی سەر تەنافەکە کۆدەکەمەوە و دەیانهێنم..
**زریان:** منیش بۆ خۆم دەچم لەتەک حاجی لەقلەقە مردووەکە رادەکشێم، پاشان خۆم لەسەر منارەکەوە هەڵدەدەمە خوار.
**زاهیر:** درۆدەکەی. ئێمە نەوەیەکی ترسنۆک و درۆزنین: نە دەتوانین خۆمان بکوژین نە دەشتوانین هیچ بگۆڕین؟ لە لەوغە و قسەی حیز زیاتر هیچی دیکەمان بۆ نەماوەتەوە.
**زازا:** ( جگەرەیەک دادەگیرسێنێ و عارەقەی نێوچەوانی دەسڕێ).
**زامار:** ( پۆستاڵ و چەقۆ لە ژوورەکەی دەباتە دەرەوە و فڕێیان دەداتە ناو تەنەکەی زبڵ).



**زاهیر:**( پشت لە جەماوەر دەکات و دەچەمێتەوە؛
وردە وردە
قوونی خۆی
رووت دەکاتەوە...

**٢٦ و ٢٧/ ٥/١٩٩٤**

**لە گۆڤاری (وێران) لە هەولێر بڵاوکراوەتەوە.**

سیناریۆی فیلمی

## گەڕانەوەی پەناهەندەیەک



**دیمەنی (١)**

**دیمەنی گشتی:** وێستگەی ئیبراهیم خەلیل لەدیوی کوردستانی عیراقەوە. قەرەباڵغی و پشکنین، بنەو بارگەی قاچاغچییان. ئۆتۆمبیل، جیپ. پۆلە ژن و پیاو و گەنج و منداڵی سەفەر: ئەوانەی دێنەوە، ئەوانەی دەڕۆن. شوفێر بانگ دەکەن: هەولێر، دهۆک، سلێمانی...

**دیمەنی گەورە:** دەستە دەستە، ئەوانەی دەگەنەوە وڵات، لەلایەن کەسوکاری خۆیانەوە پێشوازییان لێدەکرێت و لەباوەش دەکرێن.

**دیمەنی گەورە:** سێ پەناهەندە، چاو دەگێڕن. شوفێری تەکسی دەورەیان دەدەن.

**دیمەنی بچووک:** یەکێک لەو سێ پەناهەندەیە (فەرەیدوون دەکەوێتە سەر ئەژنۆ، دەگری. خۆڵ و قوڕی عەرزەکە ماچ دەکات. چنگێک خۆڵ هەڵدەگرێتەوەو دەیخوا.

**دیمەنی بچووک:** پۆلێ ژن بەپێکەنین و بەزەییەوە:

- ئەیەڕۆ، قوڕەکەی خوارد!
- کوێراییم دایە، ئاخۆ چەند ساڵە ئێرەی نەدیوەتەوە!

**دیمەنی بچووک:** یەکێک لە برادەرەکانی، فەرەیدوون هەڵدەستێنێتەوە، دەست لەمل، دەیباتە ناو تەکسیەکە. یەکێکیان لەپێشەوە، دووانیش لەدوواوە.

**دیمەنی گەورە:** ئۆتۆمبیلەکە بەرێ دەکەوێ بەرەو هەولێر.

**دیمەنی گشتی:** ئۆتۆمبیلەکە دەڕوا، بەناو شاخاندا، دەگاتە بازگەیەک.

دیمەنی (٢)

**دیمەنی گەورە:** ئۆتۆمبیلەکە لای بازگەکە دەوەستێ.

**دیمەنی بچووک:** ناو ئۆتۆمبیلەکە.

**پۆلیسی بازگە:** بەروە کوێ دەچن، کاکە؟

**شوفێر:** هەولێر.

**پۆلیس:** زەحمەت نەبێ، ناسنامەکانتان!

**فەرەیدوون:** (بەهاوارو کەیفخۆشییەوە) ناسنامەی چی و حاڵی چی، کاکە؟ ئێمە سەعاتێکە وا خۆڵ دەخۆین.

**پۆلیس:** خۆڵی چی؟

**فەرەیدوون:** خۆڵی ئەو وڵاتە جوانەی خۆمان.

**پۆلیس:** (تێدەگا پەناهەندەن هاتوونەتەوە. پێدەکەنێ) بەخێر بێنەوە!

**پۆلیسێکی تر:** بەخێر بێنەوە!

**دیمەنی بچووک:** هەر سێ پەناهەندە لەناو ئۆتۆمبیلەکەوە گۆرانییەکەی مەزهەری خالقی دەڵێنەوە:

– دەگەڕێمەوە بۆ وڵاتەکەم
دوژمن پێی خۆش بێ یان پێی ناخۆش بێ
دەگەڕێمەوە بۆ وڵاتەکەم.

**دیمەنی گەورە:** گۆرانییەکە بەردەوامەو ئۆتۆمبیل دەڕوا.

**دیمەنی گشتی:** گۆرانییەکە بەردەوامەو ئۆتۆمبیل بەناو کەژو دەشتە سەوزەکاندا دەڕوا.

دیمەنی (٣) (فلاش باگ)

**دیمەنی گشتی:** قەڵا (دیوی ئەحمەدیە)، ساڵی ١٩٨٣.

**دیمەنی گەورە:** ماڵی باوکی فەرەیدوون.

**دیمەنی بچووک:** بالکۆن و پەنجەرەکەی.



**دیمەنی بچووک:** ژوورەوەی ماڵەکە، لەپەنجەرەکەوە.

**دیمەنی بچووک:** حەوشەی ماڵەکە. (لەناکاو، بەچەک دەرگای دەرەوە دەشکێنن. حەوت چەکدار دەرژێنە ناو حەوشەکە. دایک و باوک و براو خوشکەکانی فەرەیدوون، هەترەشچوو، دێنە حەوشە).

**سەرۆک چەکدارەکان:** عدکم هارب بالبیت، وێن هووە؟

**باوکی فەرەیدوون:** (بە تکاوە) احنا ماعدنا أي هارب، سیدی!

(چەکدارەکان بەپەلەپەل دابەش دەبنە سەر ژوورەکان، تا سەربان)

**سەرۆک چەکدارەکان:** وێن هووە! گول لی!

**دایکی فەرەیدوون:** ماکوو هارب، ماکوو هارب.

**سەرۆک چەکدارەکان:** (سەر بەرز دەکاتەوە بۆ سەربان بۆ لای چەکدارەکان) فتشوا كل الغرف، حتى التواليتات.

دایکی: (بە تکاوە) وەڵڵا ماکوو. وێن هارب؟ وێن هارب؟

**سەرۆک چەکدار:** (بەقۆنداغ) اسکتی انت فتشوا زێن!

(روو لە باوکی فەرەیدوون دەکا: انت ابنک موو هارب عسکری؟

**باوک:** رایح للخارج، سیدی!

**سەرۆک چەکدار:** وێن، خارج؟

**باوک:** ئەڵمانیا، سیدی.

**سەرۆک چەکدار:** ئەڵمانیا، ها؟ واحنا هنا ندافع عن شرفکم وعن ارضکم.

**باوک:** انا ما كان عندي خبر، سيدي؟

**سەرۆک:** ابنک رایح لالمانیا واحنا نقاتل الایرانیین من

اجل شرفک وشرف ابنک الجبان! ها ؟
**دایک:** ماکوو هارب، ماکوو هارب!
**سەرۆک:** اسکتی انت.
**دیمەنی گەورە:** (شەش چەکدارەکە دێنەوە بەردەم سەرۆکەکەیان، سەر رادەوەشێنن نیشان دەدەن کە کەسیان نەدۆزیوەتەوە. سەرۆک پێش دەکەوێ و بەتوڕەییەوە دەڕۆنە دەرەوە).
**دیمەنی گەورە:** (باوک دەرگا کلۆم دەدا)
**دیمەنی گەورە:** (هەموویان، تەنیا باوک نەبێ، رادەکەنە متبەق، لای فەرەیدوون. ئەویش لەژێر بەرمیلێکی سەربەرەو خواردا دێتە دەرەوە. بەهەموویان دەست لەملی دەکەن).

**دیمەنی** (٤) (**فلاش باگ. ساڵی ١٩٨٣**)
**دیمەنی گەورە:** نیو بازنەکەی دەرگای ئەحمەدیە. فەرەیدوون بە کراس و بێجامەوە وەستاوە، دەستەکانی لەناو گیرفان، تەماشای خوارەوە دەکا.
**دیمەنی گشتی:** خوارەوەی قەڵا، لە چۆڵەوانییەکدا، سێ فیراریان لەبەردەم حەشامەتێکی خەڵکدا بەستۆتەوە.
**دیمەنی گەورە:** هەر سێ فیرارەکە گوللە باران دەکەن لەبەردەم خەڵک.
**دیمەنی گەورە:** فەرەیدوون زەندەقی دەچێ. خۆی دەدزێتەوە، دەگەڕێتەوە بۆ ماڵ.
**دیمەنی گەورە:** فەرەیدوون بە کۆڵانە تەنگەکەوە دەگەڕێتەوە پێش دەرگا. لە دەرگا دەدات و خوشکەکەی دەرگای لێ دەکاتەوە.
**دیمەنی گەورە:** حەوشە. ژوورەکان. ژوورەکەی فەرەیدوون



لە سەرەوە. فەرەیدوون لەبەردەم کتێبخانەکەیدا وەستاوە، دەگری.

**دیمەنی** (٥)

**دیمەنی گەورە:** ژووری لای بالکۆنەکەی ماڵی باوکی فەرەیدوون.
**دیمەنی بچووک:** باوکی فەرەیدوون:
– فەرەیدوون!
**خوشکەکەی:** کاکە فەرەیدوون!
**باوک:** فەرەیدوون!
**دەنگی فەرەیدوون:** بەڵێ، بابە.
**باوک:** وەرە، بزانم!
**دیمەنی گەورە:** فەرەیدوون دادەنیشێ.
**باوک:** (دەست بۆ باڵندەکانی ئەودیو پەنجەرە درێژ دەکا) ئەو باڵندانەت دیوە؟
**فەرەیدوون:** بەڵێ
**باوک:** من داوات لێ دەکەم بڕۆی!
**فەرەیدوون:** بۆ کوێ؟
**باوک:** ئەم وڵاتەی ئێمە بەجێ بێڵی و بڕۆی، بۆ خۆت وەک ئەم باڵندانە ئازاد بژیت! بەسە!
**فەرەیدوون:** حەز ناکەم. دڵم نایە بەجێتان بێڵم. ناتوانم، بابەگیان.
**باوک:** کوڕم، فەرەیدوون: حەربە!
**فەرەیدوون:** بابە گیان، دڵم نایە ئەم ماڵە خۆش و ئاسوودەیەی خۆمان جێ بهێڵم.
**باوک:** کوڕم تۆ فیراری! نە دەچی تەسلیم ببیتەوەو ببی بەعەسکەر، نە دەبیتە پێشمەرگە، نە وەرەقەی جاشان

وەردەگری... ئێ چیت لێ بکەین! ئەوەتا دوێنی، کە هاتن تەفتیشسی ئێرەیان کرد، ئەگەر تۆیان دەستگیر کردایە، منیش و دایکیشت دەبووایە لەحەژمەتان یەکسەر شێت بین! هەر رۆژێکە دەگیرێیت و دەتبەن، ئێ ئەوکاتەش یەکسەر لەبەردەم پارێزگاو لەبەردەم خەڵک دەتکەنە عیبرەت و گوللە بارانت دەکەن!

**دیمەنی گشتی:** (دەنگی رێژنەی گوللە لەدوورەوە دێت. فەرەیدوون سەری لەدەست خۆی ناوە، بێزارە).

**باوک:** برۆ، کورم ، لێرە مەمێنە!

**دایک:** فەرەیدوون، کورم، باوکت راست دەکا! هەر شەش حەوت مانگێکی دیکەیە، ئەم جەنگە شوومە تەواو دەبێت و ئیتر ئەوکاتە وەرەوە!

**فەرەیدوون:** (هەڵدەستێتەوە): باشە دەڕۆم، بە مەرجێک!

**دایک:** مەرجەکانت چین، کورم؟

**فەرەیدوون:** ئەم خانووە یادگارییەکانی منداڵیمە، خۆشم دەوێ. قەت نەیفرۆشن!

**باوک:** ئەدی مەرجی دووەم؟

**دایک:** شەش حەوت مانگی دیکە، کە ئەم جەنگە تەواو دەبێت، یەکسەر بگەڕێیتەوە!

**فەرەیدوون:** باش! (چاو فرمێسکاوی) دەڕۆم!

## دیمەنی (٦)

**دیمەنی بچووک:** ناو ئۆتۆمبیل. نزیک هەولێر کەوتوونەتەوە.

فەرەیدوون(قسە لەگەڵ هاوڕێکانی دەکا): ئاوها ئیتر! ئەم شەش مانگەی دایکم گوتی، بوو بەهەشت مانگ،



ساڵێک، دوو ساڵ، شەش ساڵ، نۆ ساڵ.. تا لەئەنجامدا بوو بە سێزدە ساڵی رەبەق! ئەوەتا ئەوا، تازە دێمەوە!

**شوفێرەکە:** یەعنی ئەتوو سێزدە ساڵە هەولێرو داک و بابی خۆت نەدیتیتەوە!

**فەرەیدوون:** بەڵێ، خاڵەگیان! سێزدە ساڵە بۆ ئەم شارە دەگریم و دەکڕوزێمەوە.

**شوفێرەکە:** دە وەڵلاهی دەتبەم لەپێش دەرکەت دادەنێم، لەپێش دەرکەی ماڵی خۆتان!

**دیمەنی گشتی:** جادەو کۆڵان و مەنزڵگاکانی ناو شار.

## دیمەنی (٧)

**دیمەنی گشتی:** ئۆتۆمبیل سەر قەڵا دەکەوێ، بەرەو دەرگای ئەحمەدیە. ئێوارە درەنگ، مەیلەو تاریکە

**دیمەنی گەورە:** ئۆتۆمبیلەکە لەسەری کۆڵانەکەی دەرگای ئەحمەدیە دەوەستێ. فەرەیدوون دادەبەزێ. چەند منداڵێکی هەژارو شڕۆڵ لەپەنا دیوارێکەوە وەستاون، سەیری فەرەیدوون دەکەن و پێدەکەنن. فەرەیدوون بەحەژمەتەوە بۆ لایان دەچێ، لەباوەشیان دەگرێ و ماچیان دەکا. هەر یەکەو نەستەلەیەکیان دەداتێ. دەگەڕێتەوە لای تەکسیەکە، جەنتایەک لەسەرشان، دووانیش بەدەستەوە، سەیرێکی منداڵەکان دەکاتەوەو دەکەوێتە سەر کۆڵانەکەی خۆیان. کۆڵانە تەنگەکە دەبڕێ.

## دیمەنی (٨)

**دیمەنی گەورە:** لەپشت سەری فەرەیدوونەوە، ناو دەرگای ماڵی باوکی. فەرەیدوون لەدەرگا دەدا.

**دیمەنی گەورە(فلاش باگ):** فەرەیدوون لەساڵی ١٩٨٣ لەگەڵ دایک و باوک و خوشک و براکانی، لەباوەش خۆشەویستی و ئاسوودەییدا.

**دیمەنی گەورە:** لەپشت سەری فەرەیدوونەوە، ناو دەرگای ماڵی باوکی. فەرەیدوون جاری دووەم لەدەرگا دەدا.

**دیمەنی گەورە (فلاش باگ):** فەرەیدوون لەساڵی ١٩٨٣ لەگەڵ منداڵەکانی خوشک و براکانی لەباوەشی خۆشی و ئاسوودەییدا، دەتریقێتەوە.

**دیمەنی گەورە:** فەرەیدوون جاری سێیەم لەدەرگا دەدا.

**دیمەنی گەورە (فلاش باگ):** حەوش و هۆڵ و متبەق و سەربان و ژوورەکان، حەمام و توالێتەکەش، کتێبخانەکەی...هتد.

**دیمەنی گەورە:** (ئەمڕۆ) سێ پێشمەرگە دەرگای لێ دەکەنەوە، چەکدارن. یەکێکیان کەڕە، یەکێکیان کوێر، ئەوەی تریان قەمبور. ماوەیەک، لەگەڵ فەرەیدوون، واق وڕماو، سەیری یەکتر دەکەن. پاشان فەرەیدوون دەکشێتە دواوەو دەیەوێ بزانێ نەوەک بەهەڵەچووبێ. فەرەیدوون روو لە یەکەمیان دەکا:

– ئێرە ماڵی کێیە؟

**دووەم چەکدار:** ئەم کەڕە، گوێی لێ نییە، کاکە!

**چەکداری سێیەم (قەمبوورەکە):** بە لاڵە پتەییەوە:

– فەر...موو.... چیتـ... دە.... و...ێ....کا...کە؟

– ئێرە ماڵی کێیە، برا؟

– ئێرە ماڵ نییە، بارەگایە!



– بارەگا چییە؟

– تۆ...ما...ڵـ..ی..کێـ...ت..دە...وێ؟

– ئێرە کاتی خۆی ماڵی ئێمە بوو.

– کەی ماڵی ئێوە بوو؟

– سێزدە ساڵ پێش ئەمڕۆ.

هەرسێکیان پێکەوە:

– هووو...وو..وو....وەه!

– من بەدوای ماڵی خۆماندا دەگەڕێم.

– ئێ؟

– لێرە نەماون؟

– ئێـ...رە... با..رە..گا..یە، کاکە!

– بارەگای چی؟

– با..رە..گا...ی...حیـ...زب!

– بۆچی کراوەتە بارەگا؟

– ئەم پرسیارانە لە ئێمە مەکە، کاکە! تۆ لەوەدەچێ تازە لە ئەوروپا گەڕابیتەوەو جارێ ئاگات لەهیچ نەبێ!

(دەیانەوێ دەرگاکە دابخەن)

**فەرەیدوون:** تکایە، پرسیارێک!

– بەڵێ؟

– دەتوانم تەنیا یەک دەقیقە تەماشایەکی خانووەکەی زەمانی منداڵیی خۆم بکەمەوە؟

– مەمـ...نوو....عە!

– تەنیا تەماشایەکی حەوشەکەمان دەکەم؟

– مەمنووعە، کاکە!

– زۆر بەپەلە، تەنیا تەماشایەکی قاڵدرمەی ژوورەکەی خۆم دەکەم.

– مەمـ..نوو...عە، کاکە!
دەرگاکە دادەخەن.

**دیمەنی گشـتی (فلاش باگ):** چەند دیمەنێکی جۆراوجۆری مـاڵەکـە، دایک و بـاوک و خـوشک و براکـانی: کـوڕەوە گەورەکەی دووای راپەڕین.

**دیمەنـی گـــــەورە:** فـەرەیدوون بەشـپـرزەیی و گـریانەوە لەدەرگادەدا. دەرگاکە دەکەنەوە.
**فەرەیدوون:** یەک پرسیاری تر، کاکە!
– مەمـ..نوو...عە!
– نازانن دایک و باوکم لەکوێن؟
– ئێمە هیچ نازانین!
– مەمـ..نوو...عە! لێرە نەماون.
(دەرگاکە دادەخەن).

**دیمەنی** (٩)
**دیمەنی گشتی:** فەرەیدوون بەهەناسە ساردییەوە جانتاکان دەخاتەوە کۆڵ. دەگەڕێتەوە سەر کۆڵانەکە. بارانە. برووسکە دەست پێدەکا. لێژ دەبێتەوە خوارەوە، یەکجار غـەمبـارو تەنیـایە. چاو بەدوای تەکسـیـەکدا دەگـێڕێ. تەکسـیـەک رادەوستێ. سوار دەبێ.
– بمەگەیەنە هوتێلی شیرین پالاس.

**دیمەنی** (١٠)
**دیمەنی گشتی:** هوتێلی شیرین پالاس: پرسگا. رەپێشی



دەکەون و ژوورێکی لەسەرەوە پیشان دەدەن.

**دیمەنی گەورە:** ژووری هوتێلەکە.
**دیمەنی گشتی(فلاش باگ+کۆلاژ):** فەرەیدوون دانیشتووە شیعر دەنووسێ.
**دەنگی فەرەیدوون:**
من بیر لە خانوویەک دەکەمەوە
بیر لە رێیەک، لە شوێن پێیەک
بمباتەوە سەر ئەو خانووە.

لەوەتەی سفرە
تامی تریفەو گۆرانی و سۆزی ون کردووە من هەر دەگەڕێم و دەگەڕێم و دەگەڕێم.

لەهەمـوو سمـۆرەیەکم پرسـیـوە، لە هەمـوو پۆلە واژەیەکی بەناوساڵکەوتووی کە لە هەوارە رەنگینەکانی
منداڵی و عەشق و گوڵمەزەکان دەگەڕێنەوە.
ئەو خانووە، با لەیەجگار دوورەوەش بێ، دەیناسمەوە:
دیوارەکانی
بە هەستی هەورینی میهرەبانی هەڵچنراون:
پەنجەرەکەی
بە پێشبینییەکی لاکێشەیی تریفەدار:
گڵۆپەکانی
زەردەخەنەی منداڵیمیان تێدا دەسووتێ.

ئەو خانووە، هەیوانەکەی:

جێ ژووانی تێک ئالآنی هەست و گیایە،
پەیژەیەکی بچکۆڵەی لێیە
کە عەشق و هەوەس
پێیدا بەرەو سەربانی سەوزی کامڵبوون و خەونبینین سەردەکەون.

ئەو خانووە
جۆیارێکی بەخشندەی پێدا تێدەپەڕێ:
هەر وەرزەی رەنگێک، هەر رۆژەی دەنگێک، هەر ساتەشی تامێکی هەیە.

من دەگەڕێم

هەر ئاواییەک بۆنی گیاو گوێزی لێ بێ
بەروە رووی دەچم،
هەر تراویلکەیەک لە درەوشانەوەی ئاسوودەی خۆیدا بانگم بکا
بەروە رووی دەچم.

لە خۆم غەریبێ، لەخۆم بێکەسێ:
زۆر دەترسم لەم کاولە ولآتە وێرانەی خۆمدا گۆڕ غەریب بم!

ئاه ! پەشیمانم!
لەئێوارەیەکی وێرانکراوی ترساودابوو
کەماڵئاواییم لەو خانووە کرد:



هەنگاوەکانم ئاوڕیان لە دەرگا هەورینەکەی دەدایەوەو هۆن هۆن دەگریان.

**دیمەنی** (١١)

**دیمەنی گشتی:** بەیانییە. فەرەیدوون لە هوتێل دەردێ، جەنتا بەدەست، دەچێتە سەر جادە. سواری تەکسیەک دەبێ.

دیمەنی گشتی (چاوی فەرەیدوونە لە پەنجەرەی تەکسیەکەوە):

**دیمەنی یەکەم:** خانووە رووخاوەکانی لای حی الچباگ

**دیمەنی دووەم:** بینایە رووخاوەکانی تەنیشت و بەرامبەرو خوارەوەی پەرلەمان.

**دیمەنی سێیەم:** مەدینەتولعابی سەر رێی عەنکاوە.

**دیمەنی چوارەم:** دوو بینایەکەی بارەگای ئیسلامیەکان.

**دیمەنی پێنجەم:** شیراتۆن.

**دیمەنی شەشەم:** (لق).

**دیمەنی حەوتەم:** دیوارەکانی دەرەوەی قەڵآ.

**دیمەنی هەشتەم:** خانووەکانی ناوەوەی قەڵآ.

**دیمەنی گەورە:** ناو تەکسیەکە

**فەرەیدوون:** کێ ئەم بیناو خانووانەی رووخاندووە؟

**شوفێر:** تۆ خەڵکی کوێیی، کاکە؟

**فەرەیدوون:** حکومەت – خۆی، یان حزبەکان؟

**شوفێر:** شەڕی براکوژی.

**فەرەیدوون:** هەست دەکەم من خەڵکی ئەم شارە نیم.

**شوفێر:** تۆ لە ئەوروپاوە گەڕاویتەتەوە؟

**فەرەیدوون:** نەخێر.

**شوفێر:** ئەدی؟

**فەرەیدوون:** لە خەوی غەفڵەت گەڕاومەتەوە.
**شوفێر:** لەکوێوە؟
**فەرەیدوون:** لە خەوی غەفڵەتەوە.
**شوفێر:** لە کوێ دادەبەزی؟
**فەرەیدوون:** (پەنجە درێژ دەکا) لەناو ئەم وێرانەیەدا.
**دیمەنی گشتی:** تەکسیەکە رادەگرێ.

**دیمەنی** (١٢)

**دیمەنی گشتی:** فەرەیدوون، بە هەموو جەنتاکانیەوە، دەچێ لە چایخانەیەک دادەنیشێ. نیگەران، غەم لە وێرانبوونی شارەکەی دەخوا. چایچیەکە چایەکی لەبەردەم دادەنێ.

**فەرەیدوون:** خاڵە، جاران دوکانێکی بەقاڵی لەم بەرامبەرە هەبوو.
**چایچیەکە:** بەڵێ: ساڵانێکی زۆرە نەماوە.
**فەرەیدوون:** دوکانی (پیرداود بەقاڵ).
**چایچیەکە:**بەڵێ، دوکانی باوکت بوو.
**فەرەیدوون:** چۆنت زانی، خاڵە؟ دەیناسی؟
**چایچیەکە:** تۆ کامەیانی، رۆڵە؟ کوڕە گەورەکەیانی؟
**فەرەیدوون:** من گەورەکەیانم. بەڵێ.
**چایچیەکە:** تۆ ئەو کاتە تەمەنت ١١-١٢ ساڵێک بوو. دەتناسمەوە، کوڕم.
**فەرەیدوون:** نازانی ئێستا باوکم دوکانی لەکوێ داناوە؟
**چایچی:** پیر بووە، کوڕم، دوکانی نەماوە. لەماڵ دانیشتووە.
**فەرەیدوون:** نازانی ماڵیان لەکوێیە؟



**چایچی:** ماڵی کێ؟
**فەرەیدوون:** ماڵی باوکم.
**چایچی:** ماڵی باوکت؟ماڵی خۆتان؟ پێنازانی؟
**فەرەیدوون:** نەخێر لە شوێنی خۆیان نەماون.
**چایچی:** زۆر دەمێکە باوکتم نەدیوە. نازانم؟
**دیمەنی گەورە:** فەرەیدوون پارەی چایەکەی، لەسەر سینیەکە جێ دێڵێ و دەڕوا. چایچیەکە، چاو ئەبڵەق، دەمی گۆ ناکا.

**دیمەنی** (١٣)

**دیمەنی گشتی:** فەرەیدوون، بە هەموو جەنتاکانیەوە لەبەردەم هوتێلی فەرید دادەبەزێ.
**دیمەنی گشتی:** فەرەیدوون لەگەڵ پرسگای هوتێل قسە دەکا، مەژغووڵە.
**دیمەنی گشتی:** فەرەیدوون دانیشتووە. کارمەندەکان لەگەڵ خاوەن هوتێلەکە دێن و دەچن.
**دیمەنی گشتی:** فەرەیدوون تەلەفۆن دەکا.
**دیمەنی گشتی:** فەرەیدوون بە پەلەو دڵخۆشییەوە دێتە دەرەوە، تەکسیەک رادەگرێ، بەجەنتاکانەوە سوار دەبێ.

**دیمەنی** (١٤)

**دیمەنی گشتی:** تەکسیەکە لەبەردەم ماڵێک رادەگرێ.
فەرەیدوون دادەبەزێ؟ لە دەرگا دەدا.
**دیمەنی گەورە:** برا گەورەکەی دەرگای لێ دەکاتەوە. بە پرتاو باوەشی پێدا دەکات.
**دیمەنی گەورە:** لە حەوشە، خوشکە گەورەکەی

هەلهەلەیەکی درێژ لێ دەدات.

### دیمەنی (١٥)

**دیمەنی گشتی:** هەلهەلە لێدانەو زەماوەندە، بەبۆنەی هاتنەوەی فەرەیدوون.

**دیمەنی گشتی:** (ماڵی باوکی فەرەیدوون) ئاهەنگی ژنانە، کەسوکاری فەرەیدوون. خاوخێزانێکی زۆری رەنگاورەنگ.

**دیمەنی گشتی:** لە سەربان، مەولوودە. دانیشتنی پیاوان.

### دیمەنی (١٦)

**دیمەنی گەورە:** فەرەیدوون بەرامبەر رەسمی دایکی وەستاوە، دەگری، خوشکە گەورەکەی، دێتە لای.

**فەرەیدوون:** خۆزگە ئەویشم بەزیندوویی بدیباوە!

خوشکەکەی (دەست لەسەر شانی دادەنێ): ئەو رۆحی خۆی بە ئێمە بەخشی، فەرە گیان.

**دیمەنی گەورە:** خوشکەکەی، سەری لەباوەشی دەگرێ. دەیباتە ژوورەکەی تر، لای خوشک و براکانی و باوکی و منداڵەکان.

**باوک:** وەرە تەنیشت من، کوڕە ئازیزەکەم. (ماچی دەکا)

**دیمەنی بچووک:** فەرەیدوون لەتەنیشت باوکی دادەنیشێ.

**برا گەورە:** ئێ، فەرەیدوون، ئێرە خۆشترە یان ئەوێ؟

**فەرەیدوون:** عەونی گیان، ئێرە!

**خوشکی بچووک:** یەعنی ناگەڕێیتەوە!

**فەرەیدوون:** با

**خوشکی بچووک:** نا، نا. مەگەڕێوە!



**فەرەیدوون:** پازدە رۆژی تر دەبێ بگەڕێمەوە.

**باوک:** پازدە رۆژی تر دەبێ بگەڕێیتەوە؟

**فەرەیدوون:** بەڵێ، بابەگیان، لەبەر ئەوەی بلیتی تەیارەم بڕیوەو دەفەوتێ.

**خوشکی گەورە:** ئێمە چۆن بە (١٥) رۆژ لێت تێر بخۆین؟

**برای بچووک:** پەساپۆرتی ئەڵمانیت هەیە؟

**فەرەیدوون:** بەڵێ، رەگەزنامەی ئەڵمانیم وەرگرتووە.

**برای بچووک:** دەی، بەڵکو بتوانیت ئێمەش لەگەڵ خۆت راپێچی ئەوێ بکەی!

**فەرەیدوون:** (روو لە برا گەورەکەی دەکا): ئێوە وەزعتان چۆنە، عەونی گیان؟

**خوشکی گەورە:** فەرەیدوون گیان، بابە وەزعی تەواو نییە، بەس!

**فەرەیدوون:** بۆچی بابە، چیتە؟

**عەونی:** فەرەیدوون، باوکمان دڵی بێرە خۆش نییە، هیچ. لەوەتەی حکوومەت خانووەکەمانی لێ سەندووەو هاتووینەتە ئێرە، ژیان وگوزەرانمان لێ تاڵ بووە.

**دیمەنی گەورە:** ناو ماڵەکە ئەوەی پێوە دیارە کە کەلوپەلی لێ فرۆشراوەو نەدارن. خوشک و منداڵەکان وردە وردە دەچنە دەرەوە.

**فەرەیدوون:** یەعنی حکومەت ئێوەی دەرکرد؟

**عەونی:** تۆ ئاگات لە هیچ نییە، فەرەیدوون. شەڕبوو، شەڕی براکوژی. ئەم شارە هەر هەمووی ببوو بە یەک پارچە ئاگر. ئێستا باشین، وەزع کەمێک ئەهوەنترە.

**فەرەیدوون:** کێ خانووەکەی لە ئێوە داگیرکرد؟ چۆن بوو؟

کێ دەری کردن؟
**عەونی:** حزبەکان.. حکومەت.. کێ دەزانێ؟
**برا بچووک:** گرنگ ئەوەیە، دەریان کردین.
**فەرەیدوون:** بۆچی؟ بۆ؟
**عەونی:** گوتیان(ماڵەکەی ئێوە لە قەڵا شوێنێکی ستراتیژی هەیە).
**فەرەیدوون:** چۆن یەعنی؟
**عەونی:** گوتیان(بەشێکی ماڵەکەتان دەکەینە بارەگای حیزب و بەشەکەی دیکەشی دەکەینە ئێزگەی تەلەفزیۆن).
**فەرەیدوون:**(فلاش باگ): دیمەنی بەردەرگای ماڵەکەی خۆیان لەگەڕەکی قەڵا، قەمبوورو کوێر و کەڕەکە: ئەو ڕۆژەی گەیشتەوە بەر ماڵێ خۆیان). ماڵێکی دێرینی ئاوها لەناو قەڵا، کە گەنجینەیەکی ئەم شارەیە... ماڵێکی وا جوان کە بەهەشتی بیرەوەرییەکانی منداڵیمانە...!
(هەڵدەستێتەوە)
خاپوور بکرێت و بکرێتە بارەگای حیزبەکان؟!
**دیمەنی گشتی:** حەوشەی ماڵی باوکی فەرەیدوون لەگەڕەکی قەڵا، داڕووخاو، پڕ کراوە لە قازو عەلەشیش و مەڕو ماڵات و پێشمەرگە.

**دیمەنی (١٧)**

**دیمەنی گشتی:** دەرگای ئەحمەدیە. فەرەیدوون و باوکی و عەونی، لەسەر سەکۆ نیوە بازنەییەکە دانیشتوون. فەرەیدوون، هەڵدەستێتەوە، نائارامە.
– ئەم خانووە عومری حەفت هەزار ساڵە، بابەگیان. شکۆمەندترین و پیرۆزترین شوێنەواری جوانی ئەم شارەیە. تۆ



چۆن دڵت هات و رازی بوویت کە بیدەیتە دەست ئەم چەکدارانە کە ئاوها وێران و خاپووری بکەن؟ شوێنەواری میللەت چۆن دەبێ بکرێتە بارەگای حزب حزبانێ؟ ئەم موڵکە، تۆ دەبێ بزانی، بابەگیان، تەنیا موڵکی تۆ نییە: موڵکی میللەتە: گەنجینەیەکی کەلەپووریی ئەم نیشتمانەیە. تۆ چۆن رازی بوویت؟ چۆن رازی بوویت؟(دەگری) پاشان بابە گیان، ئێمە، هەموومان، منداڵیی خۆمان لەناو ئەم خانووە جوانە بەسەربردووە، لەناو ئەم خانووەدا گەورە بووین و گریاوین و پێکەنیوین.. ئەم خانووە بەشێکە لە ئێمە، ئێمەش بەشێکین لەم خانووە!(دێتەوە سەرخۆی) راستییەکەت دەوێ، بابە؟ من بێ ئەم خانووە هیچ نیم: نە منداڵیم هەیە، نە ئێستا، نە داهاتوو...
**باوک:** کوڕم ، فەرەیدوون، تۆ خۆت عەڵەبی و نیگەران مەکە، با من بۆت بگێڕمەوە. ئێوارەیەک،(٥-٦) چەکدار هاتن گوتیان( بە کرێن بێت یان بە کرێ، دەمانەوێ ئەم خانووەی خۆتمان بدەیتێ!) منیش کوڕم، دەمزانی کە لەگەڵ چەکداران هیچم پێ ناکرێ. ئەمڕۆ چەکدار پاشای ئەم شارەن. ئێمەی هەولێریی قەدیمی بە پشیلەش حسێبمان ناکەن. هەستام و گوتم (کاکە، ئێوە خانوویەکم بۆ بدۆزنەوەو کرێی مانگانەم بۆ بدەن: من ئەم خانووەی خۆمتان بۆ چۆڵ دەکەم. باشە).
**فەرەیدوون:** ئێ!
**باوک:** ئیدی گوتم(با جارێ جێگایەکمان هەبێ تێیدا ستر بین، پاشان بیرێک لە فرۆشتنیشی دەکەینەوە).
**فەرەیدوون:** ئەدی ئێستا؟

**باوک:** ئێستا ئەوەتا (گۆچانەکەی بۆ خانووەکە درێژ دەکا) بەشی دەستە راستیان کردۆتە تەلەفزیۆن و بەشی دەستە چەپیش بۆتە بارەگای حیزب. رۆژ بەرۆژ وێرانتر دەبێت، تۆ برۆ ناوەوەی تەماشەکە، گریانت بۆ ئەو ماڵە جوانەی جارانمان دێت.

**فەرەیدوون:** باشە ئەدی ئێوە؟

**باوک:** تەنیا کرێی دوو مانگی یەکەمیان داینێ. لەو ساوە، ئەوا هەشت مانگە کرێیان نەداوینەتێ.
خۆمان کرێی مانگانەی ئەم خانووە تازەی خۆمان داوە.

**فەرەیدوون (هەڵدەستێتەوە):** ئەم بارەگاو تەلەفزیۆنە دەبێ لێرە نەمێنن؟

**باوک (هەڵدەستێتەوە):** کوڕە وس! کوڕە وس! سەرمان بە فەتارەت مەدە! دانیشە!

**عەونی (هەڵساوەتەوە):** شتی وا نەکەی، فەرەیدوون!

**فەرەیدوون:** دەچم دەریان دەکەم، بە هەر شێوەیەک بێ!

**عەونی:** (دەستی فەرەیدوونی گرتووە) دانیشە!

**فەرەیدوون:** بۆ؟

**عەونی:** خەتەرە

**فەرەیدوون:** ئەم خانووە یادگارەکانی منداڵیی منە، شیعرە، مێژووە، گەنجینەی نەتەوەکەمانە، بەهەر نرخێک بێ، پێویستە بیکڕینەوە! ئەم خانووە بۆتە کۆیلە، پێویستە لەمەودووا ئازاد بژی.

**عەونی:** راوەستە! ئارام بەوە! ناکرێ!

**فەرەیدوون:** بۆچی ناکرێ؟ حەز دەکەن هەروا زەلیل بژین؟ ئەمە خانووە، ئێوە تێدان؟ ئێوە (ماڵی پیردواد بەقاڵ)کە چاوێکی ئەم هەولێرەن لەم خانووە شکۆمەندو جوانەی



خۆتان هەڵقەنێنن بچن لە قوونە سەگێکی وادا بژین؟ پاشان، چۆن رازی دەبن ئەوەندە مانگە کرێتان نەدەنێ؟

**عەونی:** ئێمە منەتمان بە پارەو کرێی ئەوان نەبووەو نییە، فەرەیدوون! خۆمان داومانەو خۆشمان دەیدەین! واز بێنە فەرەیدوون! با ئەو نانەی هەمانە، ئەویشمان لێ نەبڕن!

**باوک:** کوڕم لە راهی ئەو خوایە: ریشی پیرداود بەقاڵ مەدە دەست ئەم منداڵ و تاڵانە! لێیان گەڕێ، با لە هەولێرێش دەرمان نەکەن! ئەو نانەی هەمانە، ئەویش نەبڕن، هەر چۆنێک بێ، ئێمە دەتوانین ئیدارە بکەین. ئەو زوڵمەی ئەوانیش لەم میللەتەی دەکەن، با لای خوا بێ!

**فەرەیدوون:** مەسەلەکە بۆ من ، تەنیا ئەوە نییە کە ئەمانە زوڵم لەئێوە دەکەن.

**عەونی:** ئەی؟

**فەرەیدوون:** مەسەلەکە لای من: کڕینەوەی یادگارەکانی منداڵیمە، قوتار کردنی شوێنەوارێکی نەتەوەیی حەفت هەزارساڵەیە.

**عەونی:** قسەی قۆڕ، ئەمانە، ئەو قسانەی تۆ بە پوولێک ناکڕن. شمشێری جەمشید و گەنجینەی داریووشیش لێرە، یەک فلسی سووتاو ناکا: برام! وازبێنە! سەرمان بەفەتارەت مەدە!

**فەرەیدوون:** تۆ واز بێنە، عەونی!

**عەونی:** فەرەیدوون، ئێرە ئەوروپا نییە!

**فەرەیدوون:** من هەست دەکەم منداڵیم و رابردووم زەوت کراوە!

**عەونی:** فەرەیدوون، مەچۆ!

**فەرەیدوون:** بۆچی؟

**عەونی:** با من پێت بڵێم...
**فەرەیدوون:** چییە؟
**عەونی:** تازە کار لە کار ترازاوە.
**فەرەیدوون:** چۆن؟
**عەونی:** من ئەم خانووەم فرۆشتووە!
**دیەنی گشتی:** فەرەیدوون و باوکی، واق وڕماو، وەک هەواڵی مردنی کەسێک ببیستن، دەم داپچڕاو، سەیری عەونی دەکەن.
**عەونی:** (بەنائومێدیەوە سەری داگرتووە) دەمێکە فرۆشتوومە!

**دیمەنی** (١٨)

**دیەنی گشتی:** لەسەربانەوە، لە شوێنی جۆراوجۆرەوە: ماڵی کۆست کەوتووی پیردواد بەقاڵ.
**دیەنی گەورە:** هەر خوشک و براو براژنێک، منالێک، لەگەڵ باوک، لەسووچ و گۆشەیەکی ماڵەکەدا، وەک لە پرسەیەکدا بن یان هەواڵی مردنی خۆشەویستێکیان گوێ لێ بووبێ، کڵۆڵ و غەمبار دانیشتوون، یان وەستاون بیر دەکەنەوە. لە سەرەوەش، لە ژوورەکەی سەرەوە، شەڕە قسەی نێوان فەرەیدوون و عەونی. بەدەنگی بەرز گفتوگۆیانەو هاوار بەسەر یەکتردا دەکەن.
**فەرەیدوون:** نە باوکت ئاگای لێیە، نە برات، نە خوشکت تۆ چۆن لە خۆتەوە ئەم کارە دەکەی؟
**عەونی:** ناچار بووم، ناچاربووم، ناچار بووم.
**فەرەیدوون:** باشە، بۆچی پرسیارێکت بە باوکم نەکرد؟ بۆچی؟



**عەونی:** پرسی چی پێ بکەم؟
**فەرەیدوون:** (ئەرێ بابە گیان، ئەم خانووە موڵکی تۆیەو بەناوی تۆیە. رات چییە بیفرۆشین؟) ئەمەت لێ پرسیبا!
**عەونی:** نەیدەفرۆشت، رای لەسەر نەبوو.
**فەرەیدوون:** ئێ؟
**عەونی:** ئەوساتەش ئێمە لە برسان دەمردین. دەبووایە بچین دەرۆزە بکەین.
**فەرەیدوون:** یەعنی خانووەکەت فرۆشت بۆ ئەوەی لەبرسان نەمرن؟
**عەونی:** ئەی لە خۆشییان فرۆشتوومە؟ خەڵک ئەگەر بێ پارەو برسی نەبێ موڵکی خۆی دەفرۆشێ؟ با شتێکیشت پێ بڵێم، فەرەیدوون: تۆ بۆخۆت سێزدە ساڵە لە ئەڵمانیایت و لەبەر رابواردنی خۆت ئاگات لە حاڵی ئێمە نەمابوو، نازانی ئێمە چۆن ژیاوین!
**فەرەیدوون:** چۆن ژیاون؟
**عەونی:** تۆ سەیری ماڵی باوکی خۆتت کردووە؟ سەیری خوارەوەت کردووە؟ ماڵی پیردواد بەقاڵی باوکت سێزدە ساڵ پێش ئەمڕۆ ئاوهابوو؟ ئاوها بوو، فەرەیدوون؟ چیی تێدا ماوە نەیفرۆشین؟ فەرەیدوون حەز دەکەم ئاگادارت بکەمەوە: من بەدرێژایی ئەم شەش ساڵەی دوای راپەڕین، بەهەمووی حەوت معاشم وەرگرتووە کە هەر هەموو معاشەکانیشم ناکاتە جووتێ پێڵاوی تۆ لەئەڵمانیا. ئەدی ئەگەر من خانووەکەم نەفرۆشتایە، بەچی بژیباین؟ دەرۆزە بکەین؟ بۆ تەنەکە گەنمێک بچین دەست لەخەڵک پان بکەینەوە؟
**فەرەیدوون:** یەعنی، ئێوە، ئێوە، ماڵی پیرداود بەقاڵ، واتان لێ هاتبوو دەست لەخەڵک پان بکەنەوە؟

**عەونی:** بەڵێ، بەڵێ ڕاپەڕین هەمووومانی زەلیل کرد. ڕاپەڕین هەموو کوردی ئیفلاس کرد. تۆ لە خەوی غەفڵەت هەڵساویتەتەوە. بچۆ ئەوەتا لە خوارەوە، لە باوکت بپرسە: بزانە حاڵمان چۆن بووەو چۆن ژیاوین؟ ئەی هەموو ڕۆژ پەیدا کردنی جەم و جلوبەرگی دوازدە سەر خێزان لە کوی بهێنم؟ کاک فەرەیدوون، بە قسە ئاسانە تۆ بتوانیت دووازدە کەس بەخێو بکەیت!

**فەرەیدوون:** لەگەڵ هەموو ئەمانەش، تۆ نەدەبووایە خانووەکە بفرۆشیت!

**عەونی:** بۆ؟

**فەرەیدوون:** ئەم کارەی تۆ کردووتە، حەیا چوونە، بێ ئەخلاقیە.

**عەونی:** تۆ بۆ خۆت لەئەورووپا لەباخەڵی ژنان، لەبەر رابواردنی خۆت ئاگات لە حاڵی ئێمە نەبووە: ئێستەش هاتوویتەوە پێمان دەڵێی (بێ ئەخلاق)! تۆ خۆت بێ ئەخلاقیت؟

**فەرەیدوون:** ئەگەر برا گەورەم نەبویتایە، ئەم ئیهانەیەم لێت قبوڵ نەدەکرد، عەونی.

**دیمەنی گەورە:** یەخەی یەکتریان گرتووە و لەیەکتر مۆڕ بوونەتەوە. باوکیان دەرگا دەکاتەوەو دێتە ژوورەوە. تووڕەیە.

**باوک:** یەخەی یەکتر بەردەن! فەرەیدوون ئەوە چیتە؟ خانووی فرۆشت: فرۆشت! دەستی خۆش بێ! ئەدی بەتەمای تۆ بێن لە ئەوروپاوە دۆلارمان بۆ بنێریتەوە؟ کوانێ ئەو دۆلارانەی کە دەبووایە وەک کوڕی خەڵک بۆمانی بنێریتەوە؟ خەڵک لێرە بە ئۆتۆمبیل و سەفتە دۆلاری



ئەولادی خۆیان لە ئەورووپاوە خەنی بوون. هەموو بوون بە ملیۆنێر! بزانم، دەی، کوڕی (پیرداود بەقاڵ) لە ئەوروپاوە گەڕاوەتەوە، چ شتێکی بۆ ئەم ماڵە هەژارو زەلیلەی ئێستا هێناوەتەوە کە جاران ماڵێکی خانەدان بوو؟ ها؟

**فەرەیدوون:** بابە، من دەمخوێند. شەهادەیەکی بەرزی خوێندنم لەگەڵ خۆم بەدیاری بۆتان هێناوەتەوە. ئەمە بۆ تۆ مایەی سەر بڵندییە!

**باوک:** سەربڵند، بەڵام برسی.. ئەمەیە گیروگرفتی نەوەی ئێوەی دووای ڕاپەڕین! مەگەر عەونیی براشت دەرچووی بەشی مێژوو نییە لەکولیەی موستەنسریەی بەغدا؟ ئەوەتا ئێستا دوکانی داناوە بورمەو پاقلاوە دەفرۆشێ. شەهادە بە چی دەچێ لەم وڵاتە، کوڕم؟ ئێمە شەش ساڵی ڕەبەقە، مردین لە برسان! لە بێ کارەباو بێ ئاویان جاری واهەبووە پارەی ئەوەمان نەبووە تەنەکە نەوتێک بکڕین بۆ سۆپاو خۆمانی پێ گەرم بکەینەوە! کوڕەکەم، تۆ هەر قسە مەکە! تۆ سێزدە ساڵە ڕۆیسشتووی و تازە دێییتەوە! ئێمە وامانزانیبوو تۆ مردووی! عەیبە. سێزدە ساڵە لە ئەوروپایت، ڕۆژێک لەخۆتت پرسی (ئەرێ ئاخۆ ئەو ماڵە باوکەم چۆن دەژین؟) پیردواد بەقاڵی باوکت، کە چاوێکی هەولێر بوو (دەگری) عەیب نییە کوڕەکەی، خانووی خۆیان بفرۆشێ؟ ها؟ عەیب نییە؟ عەیب..نی..یە؟

**دیمەنی گشتی:** باوکی فەرەیدوون دەگری، فەرەیدوونیش دەگری. بەسەریدا دەنووشتێتەوە. عەونیش لای خۆیەوە دەگری. سێگۆشەیەک لە شەرمەزاری و کڵۆڵی دروست دەکەن.

**دیمەنی** (١٩)

**دیمەنی گشتی:** گۆڕستان.

**دیمەنی گـەورە:** فـەرەیدوون لەسەر گـۆڕی دایکی، دەگری.

مەلایەک سوورەتان لەسەر گۆڕەکەی دەخوێنێتەوەو دەڕوا.

**فـەرەیدوون:** هەمین گیان، ئەم فـاتیحەیە تەنیا بۆ مەرگی تۆ نەبوو، بۆ مەرگی ئێـمە هەمـوومـان بوو: ئێـمـەی هەمـوو منداڵەکانی تۆ.. بەباوکیشـمەوە. ئەم فـاتیحەیە بۆ مەرگی مـاڵێک بوو کە پاش تۆ بەیەکجاری کۆتایی پێ هات،وێران کرا: بۆ خانوویەک بوو کە ئێستا فرۆشراوەو خەریکە دەبێتە ئێزگەی تەلەفزیۆن و بارەگای حزب حزبانێ.

**دیمەنی گشتی:** (فلاش باگ): ژیانی جاران...

**فـەرەیدوون:** ئەو خانووەی کە جاران کـۆشی گەرمی تۆو ئامـێـزی منداڵیی مـن و خـۆشـەویسـتـیـەکـان بوو، ئێـسـتـا خـەریکە کـەرپووچ بەکـەرپووچی وەک ددانی بـاوکم هەڵدەوەرێت و دەبێـتـە وێرانە، چۆن رزگـاری بکەم، هەمین گـیـان؟ چۆن ئەو یادگـارییـە دووره دەسـتـەی منداڵیم رزگـار بکەم؟ چۆن ئەو کۆشە گەرمە میهرەبانەی زەمانی جارانت قوتار بکەم، هەمین گیان؟ لێت دەپاڕێمەوە، هێزی ئەوەم پێ ببەخشە کە بتوانم ئەو خانووە ئازیزەمان رزگار بکەم لەدەست ئەو وێرانکارو بازرگان و بێ رەحمانە! کەرپووچەکانی، هەر دانەیەکی، گـەنجـینەیەکی حـەوت هەزار سـاڵەی پێش ئەمرۆیە. پەنجەرەکانی، هەر لایەکی، مێژووی خۆشەویستی و جـوانیـەکت بۆ دەگـێـڕێتـەوە. دەرگـاکـانی، هەر یـەکـێکی،



رۆمـانی ژیانی شکۆمـەندی مـیـرو چەلەبی و پاشـایەکی کـوردت بۆ باس دەکـا. هەمین گـیـان، لە رۆحی بەهەشـتـیت دەپاڕێمـەوە کە یارمـەتیم بدا بۆ ئەوەی بتـوانم ئەم گـەنجـینە رۆحی و نەتەوەییە قوتار بکەم ( دەگری).

**دیمەنی گشتی:** باوکی فەرەیدوون دەگاتە سەر گۆڕەکە.

**دیمەنی گەورە:** فەرەیدوون هەڵدەستێتەوەو دڵی دەداتەوە.

**بـاوک:** فەرەیدوون، رۆڵە گیان، ئامۆژگارییـەکی بچووکت دەکەم.

**فەرەیدوون:** (فرمێسکەکانی دەسرێتەوە).

**بـــاوک:** تۆ حـەوت رۆژە لێـرەی. بەدرێژایی ئەو حـەوت رۆژە، خێرو خۆشیت لە ئێمە نە دیوە. ئێمە لەجیـاتی ئەوەی دڵت خۆش بکەین و بەهاتنەوەت کامەران بین.. تۆشـمان بە دەردی خۆمانەوە تووشی کێشەو نیگەرانی کردووە.

**فـەرەیدوون:** خەتای ئێـوەی تێدا نییـە، بابەگیـان! گوناحی ئێوە نییە. نەء.

**باوک:** من ئامۆژگارییەکت دەکەم.

**فەرەیدوون:** فەرموو، بابەگیان.

**بــــاوک:** تۆ سـەری خـۆت چیـتـر بەکـێـشـەی ئەم خـانووە مەیەشێنە!

**فەرەیدوون:** چۆن؟

**باوک:** تێکەڵ مەبە!

**فــــەرەیدوون:** بابە، عـەونی هەمـوو رابردووی ئێـمـەی فرۆشتووە!

**بـاوک:** فرۆشـتوویەتی، فـرۆشـتـوویەتی! تازە هیـچمان پێ ناکرێ.

**فەرەیدوون:** بابەگیان، یەک پرسیارت لێ دەکەم!

**باوک:** ئەم؟
**فـــــەرەیدوون:** راسـتـە عـەونی خـانووەکـەی بۆ ئەوەی فرۆشتووە کە بەخێوتان بکا؟ راستە ئێوە بێ پارەو هەژار ژیاون؟
**باوک:** (وەک شایەکی زەلیل، چاو دادەگرێ) راستە.
**فەرەیدوون:** (وەک شازادەیەکی زەلیل، چاو دادەگرێ).
**باوک:** بەڵام من بەمەم نەدەزانی نەمدەزانی چەندین ساڵە بە پارەی خانووە فرۆشراوەکەمان ژیاوین.
**فەرەیدوون(دەگری):** بۆ بە منتان نەدەگوت؟ بۆ ئاگادارتان نەدەکردمەوە؟
**باوک:** ئامۆژگاریت دەکەم بگەڕێیتەوە، رۆڵەکەم!
**فەرەیدوون:** چۆن؟
**بـــــاوک:** چیـتـر سـەری خـۆت بە زەلیلیی ژیانی ئێـمـە مەیەشێنە: رۆڵەکەم بگەڕێوە وڵاتی خۆت!
**فەرەیدوون:** ئێرە وڵاتی منە، بابە! ئێرە!
**بـــاوک:** واز لەکێشـەی ئەم خانووە دمۆرە بێنەو بگەڕێوە ئەڵمانیا.. بۆ ژیانی خۆت!
**فەرەیدوون:** (هەڵدەستێتەوە)
– من بڕیارم داوە، بابەگیان.
**باوک:** بڕیاری چی؟
**فەرەیدوون:** ناگەڕێمەوە؟

**دیمەنی (٢٠)**

**دیمەنی گـشـتی:** ناو مـاڵی باوکی فـەرەیدوون. حـەوشـە. قـەرەباڵغـیی خزم و کـەسـوکـار. عـەونی، زیزو غـەمـبـار لە گۆشەیەکی لاچەپ جگەرە دەکێشێ. جەنتاکانی فەرەیدوون داندراون و شـتـەکـانی پێـچـراونەتەوە. منداڵەکـان لەبەرێ



کـردنی فـەرەیدووندا خـەریکن بگرین. پەژارەو هەسـتی ماڵئاوایی کردن لەفەرەیدوون فەرمانڕەوایە.
**باوک:** هەڵسە! دە هەڵسە، کوڕم. درەنگە! بگەڕێوە!
**فەرەیدوون:** (روو لەهەموویان دەکا):
– ئێستا ئێوە ئەم قەرەباڵغیەتان بۆچی لێرە دروست کرد؟
**بـــاوک:** کوڕم، شێـرزاد، هەڵسـە: جەنتاکـانی هەڵگرەو بیگەیەنە گەراج.
**فـەرەیدوون:** بابە گیان، من پێم وتی: ناگەڕێمەوە! بڕیارم داوە!
**باوک:** بڕیاری چیت داوە کوڕم؟ شێت بووی؟
**فەرەیدوون:** بڕیارم داوە ناگەڕێمەوە. لێرە دەژیم.
**بـــاوک:** کوڕم تۆ شێت بووی؟ ئەو ئەڵمانیا خۆشە بەجێ دێڵـیت و لێـرە دەژی؟ بۆ ئەوەی وەکـو ئێـمـە شێت ببیت و وەک ئێمە زەلیل و سەفیل ببی؟
**فەرەیدوون:** بەڵێ!
**بـــاوک:** کوڕم، جنسیـەو پەساپۆرتی ئەڵمانیت لەقـیس دەچێ!
**فەرەیدوون:** نامەوێ.
**بـــاوک:** کوڕی خـۆم، خەڵک ئێـسـتا لێـرە غـار دەدەن و خواخوایانە بگەنە ئەوێ! تۆ ئەوێ بەجێ دێڵیت و دێی لێرە دەژی؟
**فـەرەیدوون:** بەڵێ. تەنانەت هەست بەگوناه و ئازارێکی ویژدانیی گـەورەش دەکـەم کـە چەندین سـاڵە، وەک ئێـوە، هەمان ئازاری ژیانی ئێرەی ئێوەم نەچەشتووە!
**عەونی:** یەعنی داتناوە نەگەڕێیتەوە، فەرەیدوون؟
**فـەرەیدوون:** بەڵێ. ناگەڕێمەوە. هەتا هەتایە ئەم وێرانەی

ئێره مەنزڵگای منه. من کوڕی ئەم وێرانەیەم.
**باوک:** باشه، تۆ خۆت گوتت که بۆ پازده ڕۆژ هاتوویتەتەوه. شەش حەوت ڕۆژێکت ماوه، دەبێ بگەڕێیتەوه.
**فەرەیدوون:** من وامدەزانی خەڵکانێک لێره خەریکی بنیاتنان و ئاوەدانکردنەوەن. وامدەزانی لێره خەریکی جوانکردن و دروستکردن و خۆشکردنی ئەم شارەن، بەڵام من لەخەوی غەفڵەتدا بووم: بۆم دەرکەوت که مەسەلەکه بەپێچەوانەیه.
**باوک:** کوڕم، فەرەیدوون: واز لەم قسانه بێنه! بگەڕێوه ئەو ئەڵمانیا خۆشەی خۆت!
**فەرەیدوون:** ئێره بۆ من لەوێ خۆشتره.
**باوک:** کوڕم بگەڕێوه!
**فەرەیدوون:** من تازه هەرگیزاو هەرگیز ناگەڕێمەوه! بەسیه ئیتر! هەر له ئێستاشەوه ئیعلانی شەڕی خۆم دەکەم.
**باوک:** شەڕ دژی کێ؟
**فەرەیدوون:** دژی حکومەت، دژی حزبەکان.. دژی هەر لایەن و کەسێک کەدەستی له زەوتکردن و وێرانکردنی خانووەکەی ئێمەدا هەیه!
**عەونی:** خانوو. خانوو. خانوو، فرۆشرا. خواردمان. برسێتی و بەدبەختی و بێ پارەیی دوای راپەڕین قووتی دا. تەواو!
**فەرەیدوون:** (تووڕەیه) ئەم خانووەی ئێمه، هەموو عومری منداڵی و گەنجیمه، بریتییه لەهەموو مێژووی شارەکەم. من هەموو کوردستان لەم خانووەدا دەبینم. دەبێ بەهەر نرخێک بێ، بیکڕمەوه!



**باوک:** به چی دەیکڕیتەوه؟تۆ که هاتیتەوه گوتت(تەنیا سێ سەد دۆلارم لەگەڵ خۆم هێناوەتەوه): به چی دەیکڕیتەوه؟
**فەرەیدوون:** رەگەزنامەو پەساپۆرته ئەڵمانیەکەم دەفرۆشم. هەردووکیان، بەڤیزەکەشمەوه، چوار هەزار دۆلار دەکا! هەرچی پارەشم له بانقی ئەڵمانیا هەیه رایدەکێشم و وەری دەگرمەوه.

**دیمەنی** (٢١)

**دیمەنی گشتی:** ئەو چایخانەیەی شەڕه کەڵەشێری تێدا دەکرێ له هەولێر، چایخانەی کەوبازان.
**دیمەنی گەوره:** فەرەیدوون لەلایەکی چایخانەکه، لەگەڵ سەلیم قاقا دانیشتووه، بەرامبەر دوکانی بازرگانێک.
**فەرەیدوون:** مام سەلیم، ئەم حاجی عەبۆیه کێیه؟ (دەست بۆ دوکانی بازرگانەکه درێژ دەکا).
**سەلیم قاقا:** بازرگانێکی زۆر دەوڵەمەنده، کوڕم، بۆچی؟
**فەرەیدوون:** چیتر؟ پێم بڵێ!
**دیمەنی گشتی:** بازرگانەکه مەژوولی پاره ژماردنه.
**سەلیم قاقا:** بەینی لەگەڵ حکومەت و حزبەکانیش زۆر خۆشه.
**فەرەیدوون:** هەولێریی شارستانه یا گوندی؟
**سەلیم قاقا:** تەماشای سەرو جەمەدانیەکەی بکەی، دیاره، کوڕم.
**فەرەیدوون:** به عەقڵی دەڵێم، مام سەلیم، به عەقڵی؟
**سەلیم قاقا:** جینگزه. قیچکه تەنگه. به هەولێریی شارستان ناچێ؟. بەڵام پێم بڵێ چیت لێی دەوێ؟

**فەرەیدوون:** خانووەکەی باوکمی کڕیوە.
**سەلیم قاقا:** ئێ؟
**فەرەیدوون:** دەمەوێ لێی بکڕمەوە.
**سەلیم قاقا:** (پێدەکەنێ).
**فەرەیدوون:** بە چی پێدەکەنی، مام سەلیم؟
**سەلیم قاقا:** تۆ لە شەڕە کەڵەباب دەزانی؟
**دیمەنی گەورە:** شەڕە کەڵەشێری ناو چایخانەکە.
**دیمەنی گشتی:** شەڕە کەڵەشێری ناوچایخانەکە.

**دیمەنی (٢٢)**

**دیمەنی گشتی:** چایخانەی مەچکۆ
**دیمەنی گەورە:** پیرداود بەقاڵ دانیشتووە، عەبایەکی لەسەرشان، نێرگلە دەکێشێ. حاجی عەبۆ بە تووڕەییەوە خۆی و دوو چەکدار دێنە ژوورەوە: بەرامبەر پیردواد بەقاڵ (باوکی فەرەیدوون ) رادەوەستن.
**حاجی عەبۆ:** پیرداود بەقاڵ، مەرحەبا!
**باوکی فەرەیدوون:** ئەهلەن، مام حاجی!
**حاجی عەبۆ:** کوڕەکەت لە خاریج هاتۆتەوە، کەس نەماوە لە هەولێر، دەیەوێ شەڕ بە من بفرۆشێ؟
**باوکی فەرەیدوون:** چیی کردووە؟
**حاجی عەبۆ:** ئاگات لێ نییە؟
**باوک:** نەخێر.
**حاجی عەبۆ:** گوێ بگرە مامە، من لەبەر خاتری ردێنی تۆ زیاترم لەگەڵ نەگوت. ئێوە کاتی خۆی ئەو خانووەتان فرۆشتە من. وایە یان نا؟ من، بە سەنەد و شایەدیی دوو پیاو ماقووڵ، کڕیم، تەواو ئیدی.



ئێستا کوڕەکەی خاریجت هاتۆتەوە دەڵێ(یان دەبێ بیفرۆشیتەوە من، یانیش نابێ بەکرێ بیدەیتە تەلەفزیۆن و بارەگای حزبەکان).
**یەکێ لە چەکدارەکان:** موڵک موڵکی خۆیەتی، بیکاتە سەرپێخانە یان بیکاتە مەیدانی کەران. ئارەزووی خۆیەتی! ئەو کوڕەی تۆ کێیە رێ لە ئازادیی خەڵک دەگرێ؟
**چەکداری دووەم:** خاڵە پیرداود، ئێمە هاتووینەتە لات بۆ ئەوەی ئامۆژگاریی بکەیت!
**حاجی عەبۆ:** خواحافیز مامە پیرە.

**دیمەنی (٢٣)**

**دیمەنی گشتی:** نووسینگەی فاکس و تەلەفۆناتی جیهان
**دیمەنی گەورە:** ناوەوەی نوسینگەکە، فەرەیدوون تەلەفۆن دەکا.
**دیمەنی گشتی:** فەرەیدوون دێتە دەرەوە، دەیەوێ فاکس بنێرێ.
**دیمەنی گەورە:** فەرەیدوون مەژوولی فاکس ناردنە.
**فەرەیدوون:** بەپێی ئەو گفتەی پێیان دام، پێویستە پێنج رۆژی دیکە ئەو پارەیەمان هەموو بەدەست بگات.
**خاوەنی نووسینگەکە:** ئەمە یەکەم جار نییە پارە لە ئەورووپاوە تەحویلی سەر بانقی ئێمە دەکرێت.
**فەرەیدوون:** دڵنیا بم؟
**خاوەنی نووسینگە:** دڵنیابە!

**دیمەنی(٢٤)**

**دیمەنی گشتی:** بازاڕی دۆلار فرۆشان.
**دیمەنی گەورە:** فەرەیدوون لە بازاڕی دۆلار فرۆشان، لەگەڵ

عەونیو دوو برادەر، جەنتایەکیان پێیە، لە ناو دوکانێکدا سەرقاڵن. لە پەساپۆرت و ڕەگەزنامە ئەڵمانیەکەی دەکۆڵنەوە، بابەتی قسەو وردبوونەوەیانە لەگەڵ جەماعەتێک. عەونی دێتە پێش دەرگاکە، پاسەوانی دەکا. فەرەیدوون و دوو برادەرەکەی، دووای پێکهاتن، دێنە دەرەوە.

عەونی لێی دەپرسێ:

– بە چەند پێکهاتن؟

**فەرەیدوون:** چوار هەزارو حەفت لەد دۆلار.

**دیمەنی (٢٥)**

**دیمەنی گشتی:** چایخانەی کەوبازان.

**دیمەنی گەورە:** فەرەیدوون دەگاتە بەردەم دوکانی حاجی عەبۆی بازرگان. دەچێتە ژوورەوە

**فەرەیدوون:** حاجی عەبۆ، من کوڕی پیاوێکم، وەکو جەنابت، هەولێریی شارستانەو خەڵک دەیناسێ.

**حاجی عەبۆ:** ئێ!

**فەرەیدوون:** نە لە باوکم، نە لە من ناوەشێتەوە، بەزۆریی زۆردارەکی موڵک لەدەست خەڵک دەربهێنین.

**حاجی عەبۆ:** کوڕم، من پەنجا ساڵ زیاترە باوکت دەناسم.

**فەرەیدوون:** خانووەکە، ئێستا چەندی دەکا؟

**حاجی عەبۆ:** نایفرۆشمەوە.

**فەرەیدوون:** ئێستا پێم بڵێ چەندی دەکا؟

**حاجی عەبۆ:** نایفرۆشم.

**فەرەیدوون:** باشە هەر پێم بڵێ، چەندی دەکا؟

**حاجی عەبۆ:** نایفرۆشم.



**فەرەیدوون:** باشە، باش! تەنیا ئەوەندەم پێ بڵێ(چەندی دەکا)؟

**حاجی عەبۆ:** من بەشێکیم فرۆشتووە بۆ ئەوەی بیکەنە تەلەفزیۆن، بەشەکەی دیکەشیان کردۆتە بارەگای حزب.

**فەرەیدوون:** تۆ ناو خانووەکەت دیوە: چۆن هەر ڕۆژێک چەند کەرپووچ و پەنجەرەیەکی لێ دەردەهێنن؟

**حاجی عەبۆ:** ئا.

**فەرەیدوون:** تۆ ناو خانوەکەت دیوە، چۆن ڕۆژ بەرۆژ کاولترو وێرانتری دەکەن؟

**حاجی عەبۆ:** من مانگانە کرێی خۆم وەردەگرم. تەواو.

**فەرەیدوون:** تۆ ئاگاداری کە چەند ڕۆژێکی دیکە بلدۆزەر دەهێنن و چەند لادیوارێکی ناوەوەو دەرەوەی دەڕووخێنن.

**حاجی عەبۆ:** کوڕم، من کرێی خۆم وەردەگرم.

**فەرەیدوون:** تۆ یەک تۆزقاڵ چیە بەزەییت بە مێژووی شارەکەی خۆتدا نایەتەوە! یەک تۆزقاڵ چیە شەرەفی باب و باپیرانی خۆتت ناوێ!

**حاجی عەبۆ:** تۆ لە خاریج چیت خوێندووە، کوڕم؟

**فەرەیدوون:** ئارکیۆلۆژیا.

**حاجی عەبۆ:** چی؟

**فەرەیدوون:** شوێنەوارناس (عیلمی ئاسار)

**حاجی عەبۆ:** کوڕم، من لەو عیلم و میلمە تێناگەم. بەکرێم داوەتە ئەوان و شەرمەزارم مەکە. (دەنگی نزم دەکا) کوڕم هەرکەسێک ئاغا بێت، ئێمە ڕەعیەتین. ناوێرم لێیان بسەنمەوە.

**فەرەیدوون:** چەند ڕۆژێکی دیکە دێن بەبلدۆزەر دەکەونە گیانی خانووەکەمان، مام حاجی!

**حاجی عەبۆ:** ئاگام لێیە، کوڕم، تەعمیری دەکەن

**فەرەیدوون:** وێرانی دەکەن، کاولی دەکەن، تەعمیری چی؟ خانووی ئەم قەڵا دێرینە، هی ئەوە نیە بکرێتە بارەگای تەلەفزیۆن و حزب و وێران بکرێت!

**دیمەنی گشتی:** حەوشەی ماڵی پیرداود بەقاڵ، داروخاو، پڕ کراوە لە قازو عەلەشیش و مەڕو ماڵات.

**فەرەیدوون:** حاجی گیان، کاولی دەکەن، خاپووری دەکەن.

**حاجی عەبۆ:** کوڕم، من مەمنوونم کە کرێیەکەشم دەدەنێ.

**فەرەیدوون:** ئەوان مانگانە چەندت دەدەنێ: من هەموو مانگێک دە ئەوەندەت دەدەمێ!

**حاجی عەبۆ:** ئەوان مانگانە پێنج سەد دینارم دەدەنێ.

**فەرەیدوون:** من مانگانە هەزار دینارت دەدەمێ.

**حاجی عەبۆ:** لێم گەڕێ، کوڕم!

**فەرەیدوون:** من دەمەوێ منداڵی و مێژووی خۆم رزگار بکەم، یارمەتیم بدە.. مام حاجی!

**حاجی عەبۆ:** لێم گەڕێ!

**فەرەیدوون:** بۆچی؟

**حاجی عەبۆ:** بەینی خۆمان بێ، کوڕم...

**فەرەیدوون:** ئێ؟

**حاجی عەبۆ:** خانووەکەم فرۆشتووە.

**فەرەیدوون:** فرۆشتت بە کێ؟

**حاجی عەبۆ:** بە ئەوان ... نازانم سەر بە کام لایەن و کێن؟ بۆ خۆیان دەیکەنە بارەگاو تەلەفزیۆن و سینەمەو مینەمە.. کەیفی خۆیانە.

**فەرەیدوون:** کەی فرۆشتت؟

**حاجی:** دوێنێ عەقدو مەقدمان نووسی و تەواو،



پارەکەشم وەرگرتووە. ئیدی ئازادن بۆ خۆیان، ئەگەر ئێستا بیانەوێ بیڕووخێنن یا بیکەنە شتی تر. ئەمڕۆ بلدۆزەرەکان دێن.

**فەرەیدوون:** هەر ئەمڕۆ کەی؟

**حاجی:** ئێوارە.

**فەرەیدوون:** ئێوارە؟

**حاجی:** وایان پێ گوتم.

**فەرەیدوون:** سەعات چەند؟

**حاجی:** دایانناوە دیوارەکانی ناوەوەی بڕووخێنن، هەردوو بەشەکەی بکەن بە یەک بەش.

**فەرەیدوون:** خواحافیز، حاجی!

**دیمەنی گەورە:** فەرەیدوون بەپەلە رادەکا.

**دیمەنی (٢٦)**

**دیمەنی گشتی:** فەرەیدوون بە هەموو هێزی لە دوکانی حاجی عەبۆوە بەناو بازاڕی نەجاڕو پەنیر فرۆشان رادەکا، بە ناوخەڵکدا.

**دیمەنی گەورە:**فەرەیدوون رادەکا.

**دیمەنی گشتی:** فەرەیدوون بەناو بازاڕدا رادەکا بەرەو سەرجادەکەی بەردەم چایخانەی مەچکۆ.

**دیمەنی گەورە:** فەریدوون دەگاتە لای تەکسیەکان و سواری تەکسیەک دەبێ.

**دیمەنی (٢٧)**

**دیمەنی گشتی:** وەزارەتی رۆشنبیری.

**دیمەنی گەورە:** فەرەیدوون لەبەردەم وەزارەت دادەبەزێ و

بەپەلە دەچێتە ژوورەوە.

**دیمەنی** (٢٨)

**دیمەنی گەورە:** فەرەیدوون دەچێتە لای سکرتێری وەزیر، چەند لاپەڕەیەکی سپیی لێ وەردەگرێت. لەسەر کورسی و مێزێکی چۆڵدا دەکەوێتە نووسین. سکرتێری وەزیر تەلەفۆن دەکا.

**دیمەنی** (٢٩)

**دیمەنی گەورە:** کامێرا لەپشت سەری وەزیری ڕۆشنبیرییەوە:

وەزیر نامەکە دەخوێنێتەوە(بەدەنگی فەرەیدوون )، فەرەیدوونیش بەرامبەری وەستاوە:

زۆر بەڕێزو خۆشەویست،

جەنابی وەزیری ڕۆشنبیری حکومەتی هەرێمی کوردستان!

دووای سلاوو ڕێز،

ئاواتەخوازم ناوەڕۆکی ئەم نامەیە، کە پەیوەندیی بەپیرۆزترین و دێرینترین شوێنی ئەم کوردستانەوە هەیە، وا لەبەڕێزتان بکات کە دەم و دەست، هەر ئێستا، بڕیار بدەن دەست بدەنە تەلەفۆن و بە بەڕێوەبەری ئاسایش بڵێن کە تیمێکی پۆلیسی ئاسایش بنێرنە قەڵاو داوا بکەن کە رووخاندنی خانووە گەورەکەی لای دەرگای ئەحمەدیەی قەڵا رابگرن!

**دیمەنی گەورە:** جەنابی وەزیر کەمێک دەشڵەژێ لە نامەکە زیاتر ورد دەبێتەوە:

جەنابی وەزیر،



خانووی ناوبراو، وەک دەزانن، میراتێکی جوانی حەوت هەزار ساڵ پێش ئەمڕۆی کوردە. گەنجینەیەکی ڕەنگینی ئارکیۆلۆژیی نەتەوەکەمانە، یادگارێکی شکۆمەندی میرو پاشاو بابەگەورە دێرینەکانمانە. ئارشیتێکتووری ئەم خانووە، کە بە دەستی نەققارو بیناسازە بلیمەتە کۆنەکانی خۆمان دروستکراوە، یەکێکە لە دەگمەنترین و جوانترین ئارشیتێکتوورەکانی ئەم وڵاتە وێرانەیەمان. حەتمەن، هەر دەبێ کەسێکی وەکو ئێوە لەنرخ و بایەخی ئارکیۆلۆژی و ئارشیتێکتی ئەم گەنجینە جوانە نیشتمانییە گەورەیە تێ بگات!

خانووی ناوبراو، سێزدە ساڵ پێش ئەمڕۆ، موڵکی پیاوێکی ناوداری ئەم هەولێرە بوو، پیردواد بەقاڵ، کە دەکاتە باوکی من. دووای ڕۆشتنی من بۆ هەندەران، برا گەورەکەم، عەونی، لەبەر نەداری و بێ پارەیی و لە هەمان کاتدا لەسەر داخوازیی بەزەبری حزبایەتی، ناچار بوو خانووەکە بفرۆشێتە پیاوێک بەناوی حاجی عەبۆی بازرگان، ئەویش، لەبەر هەمان هۆی ناوبراو، ئێستا فرۆشتوویەتی بەیەکێک لەحزبەکانی کوردستان – نازانم کامەیانە؟

ئەم خانووە، کە من هەموو تەمەنی خۆشەویستی منداڵی و گەنجێتیی خۆمم تێدا بەسەر بردووە: وەک مەرگی خۆم و وەک مەرگی هەموو کوردستانی دەبینم کە ئێستا خەریکن رۆژ لە دووای رۆژ وێرانترو ناشیرینتری دەکەن.

خانووی ناوبراو، ئەگەر لە وڵاتێکی دیکە بووایە، وەک بیلبیلەی چاو دەپارێزراو خزمەت دەکراو دەکرایە مەڵبەندێکی تووریستی و گەنجینەیەکی نیشتمانی، یان مۆزەخانەیەک: کەچی – چونکە لەوڵاتێکی کەودەن و

هەژاری وەک ئێمە دایە – ئەوەتا ئەمڕۆ ، ئێوارە، کاتژمێر سێ، دێن بە بلدۆزەر بەردەبنە گیانی و دیوارەکانی دەرەوەی و چەند دیوارێکی ناوەوەی دەڕووخێنن: دەیکەنە بارەگای حزب!

بەڕێز جەنابی وەزیر،

بچووکتان، وەک هاوڵاتیەک و وەک تایبەتمەندێکی بواری ئارکیۆلۆژیا، بە مافی خۆمی دەزانم کە ڕێگە بەخۆم بدەم لەمەترسیی ئەم کارە ناهەموارو خەتەرناکە ئاگادارتان بکەمەوەو داخوازیتان لێ بکەم، ئەگەر ڕێگەم بدەن، کە هەر ئێستا – بەتەلەفۆن بێ یان بەوەسیلەی تر – تەدەخولێکی ڕاستەوخۆ لەم کارەدا بکەن! چونکە ڕزگارکردنی مێژووی پڕ سەروەریی ئەم خانووە، قوتارکردنی جوانی و شکۆمەندیی ئەم گەنجینەیە، تەنیا لەدەست ئێوەدایە. تکاو داخوازیم لە بەڕێزتان ئەوەیە، کە – تا ئەو کاتەی ، بەم نزیکانە، خانووەکە، بەهەر نرخێک بێ دەکڕمەوە – جەنابتان ئەمر بفەرموون کە ڕووخاندنی ئەم خانووە دەم و دەست ڕابگیرێ! من جنسیەی ئەڵمانی خۆم فرۆشتووەو هەرچی پارەشم لە بانقی خۆم لە ئەڵمانیا هەیە ڕامکێشاوە، بۆ ئەوەی بتوانم (ئەم خانووە) ڕزگار بکەم! تکایە یارمەتیم بدەن!

**بچووکتان**

**د. فەرەیدوون پیرداود بەقاڵ**

**دکتۆرا لە ئارکیۆلۆژیای زانکۆی بەرلین – ئەڵمانیا**

**دیمەنی (٣٠)**

**دیمەنی گشتی:** چەند تیمێکی ڕووخاندن، بەکرێکارانەوە، لەگەڵ دوو بلدۆزەر، لەبەردەرگای ناوبازاڕی قەڵا، دیوی لای



ئیبن مستۆفی، لەسەر جادەکەی خوارەوە خەریکن خۆیان ئامادە دەکەن بەسەر جادەی قەڵا هەڵگەڕێن.

**دیمەنی گەورە:** بلدۆزەرەکان، کرێکارەکان، تیمەکان.

**دیمەنی گشتی:** چەند تیمێکی ڕووخاندنی بینایە، بەکرێکارانەوە، لەگەڵ دوو بلدۆزەر، لەبەر دەرگای قەڵا، دیوی ئەحمەدیە، لەسەر جادەکەی خوارەوە، خەریکن خۆیان ئامادە دەکەن کەبەسەر جادەکەی قەڵا هەڵگەڕێن.

**دیمەنی گەورە:** بلدۆزەرەکان. کرێکارەکان، تیمەکان... دەچن بۆ ئەوەی (خانووەکە) بڕووخێنن...

**هەولێر – زستانی ١٩٩٧**

*** لە گۆڤاری (نووسەری نوێ) لە هەولێر بڵاوکراوەتەوە.**

